# پـــــرۆدۆن

## جـــۆرج گـــۆرڤیچ

وەرگێڕانی

ئارام ئەمین



جورج غورويتش
برودون
ترجمة: ابراهيم العريس
المؤسسة العربية للدراسات والنشر
الطبع الاولى ١٩٧٦

**ناوی کتێب: پرۆدۆن**

- نووسینی: جۆرج گۆرڤیچ
- وەرگێڕانی: ئارام ئەمین
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٥٩٧
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب —٨١— (١٨٤)

**دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی**
**www.mukiryani.com**
**asokareem@ maktoob.com**
**Tel: 2260311**

## ناوەڕۆک







---

**پێشکەشە بە :**

دۆستان و ئەزیزانم

# مێژووەکان لە ژیانی پرۆدۆن

١٥ی کانوونی دووەمی ١٨٠٩ لە (بیزانسۆن لە دایك بووە)

١٨٢٦ سەرەتای دەست بەکاربوونی لە چاپخانە لە هەمان شاری خۆی .

١٨٣٧ یەکەم نامەی خۆی لەمەر (( ڕێسا گشتییەکان)) بلاوکردەوە.

١٨٣٨ لە ئەکادیمیای بیزانسۆن زەمالەی وەرگرت.

١٨٤١ هەڵوەشانەوەی زەمالەکە دوای بلاو بوونەوەی (( مولکایەتی چییە؟ )).

١٨٤٢ دەستگیرکردن و ئازاردانی دوای بلاوبوونەوەی((هۆشیاری بۆ مولکدارەکان )).

١٨٤٦ گرینگترین کتێبی خۆی نووسی ((سیستەمی دژپێکە ئابوورییەکان )).

١٨٤٣ لە لیۆن ژیاوە تا ساڵی ١٨٤٧ لە بزووتنەوەی رادیکالی چالاکی نواند.

١٨٤٧ بۆتە سەرنووسەری گۆڤاری (( نوێنەری گەل )) دوای ئەو ((گەل )) کەدواتر بووە ((دەنگی گەل )).



١٨٤٩ بە هۆی هێرشەکانی بۆ سەر حکوومەت دەستگیرکراوەتەوە و سێ ساڵ لە زیندانداماوەتەوە.

١٨٥٨ کتێبی ((دادپەروەری لە شۆڕش و کلێسا)) بلاوکردەوە، کە بووە هۆی شەپۆلێکی نارەزایی لەلایەن کە هنوتییەوە کە پاڵی پێوەنا بڕوا بۆ برۆکسل و ببێتە پەنابەر.

١٨٥٩ بە بڕیارێکی بەخشینی گشتی لێی بوردرا.

١٨٦٠ گەڕایەوە پاریس و دەستی بە چالاکی نهێنی کرد. ١٦ی کانونی دووەمی ١٨٦٥ لە پاریس لە تەمەنی پەنجا و شەش ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

# ژیانی پرۆدۆن

بەیار جۆزیف پرۆدۆن – Pierre – Joseph Proudhon لە بیزانسۆن لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٠٩ ز لە دایك بووە، باوکی بەرمیل ساز بووەو دایکی کابان. دوای ((٥٦)) پەنجا و شەش ساڵ واتە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٦٥ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.

سەبارەت بە قوتابخانە، پرۆدۆن کاتێ چووە قۆناغی ناوەندیی و زەمالەی خوێندنی لە کۆلیژی بیزانسۆن وەرگرت، دوای ئەوە چەندین خەڵاتی زیرەکیشی وەرگرت. کە تەمەنی گەیشتە حەڤدە ساڵی پێش بە دەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس بۆ بەرێوەبردنی خێزانەکەی ناچار بوو واز لە خوێندن بێنێ. پاشان یەکسەر بووە کارمەندی چاپخانە، بەڵام ئەو چاپخانەیەی کاری تێدا دەکرد دوای چەند ساڵێك نابووت بوو، ئەمەش وای لێکرد بێ کار بمێنێتەوە، بۆیە بەناچاری بیزانسۆنی جێهێشت و بۆ ماوەی دوو ساڵ هەر ئەم شار و ئەو شاری دەکرد (( نیوشاتل مارسیلیا، دراگیسنیان. تۆلۆن ... هتد)) ، لە چاپخانەیەك بۆ چاپخانەیەکی تر بۆ ئەوەی کارێکی دەستبکەوێ. لە کۆتاییدا بەخت بۆی پێکەنی و تووشی دوو هاورێ کۆلیژی بوو، کە برایانی گۆتیەیان پێ دەگوتن، برۆدۆن لەم چاپخانەیەدا وەکو پیتچنی سەرەکی کاری دەکرد. چەند ساڵێك لەم چاپخانەیە مایەوە، واتە تاکو ساڵی ١٨٣٨ ز کاتێك ئەکادیمیای بیزانسۆن زەمالەی سواردیان بۆ دابینکرد. لێرەدا سوودی لەو توانایە وەرگرت کە پیشەکەی وەکو فەرمانبەری چاپخانە بۆی فەراهەم کردبوو، هەروەها سوودی لەو کاتە بەتاڵانە وەرگرت و چەندەها کتێبی خوێندەوە، هەر لەوێ یەکەم



کتێبی خۆی نووسی بەناوی "لێکۆڵینەوە دەربارەی وتەزا رێزمانیەکان". دوای ئەوەی خۆی کتێبەکەی بە چاپ گەیاند، یەکسەر ناردی بۆ پەیمانگای زانستە ئاکاری و سیاسییەکان لە ساڵی ١٨٣٦، لە پێناو بەدەست هێنانی خەڵاتی "ڤۆلینی". بەڵام کە لەوێ هێمای رێزگرتنی وەرگرت، سەرنجی چەند ئەندامێکی ئەکادیمیای بیزانسۆنی بەلای خۆیدا راکێشا و کردیان بە کاندیدی خۆیان بۆ بە دەستهێنانی زەمالەی "سوار". بەڵام دەبوایە پرۆدۆن بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بەدەست بهێنایە، بۆ ئەوەی زەمالەکە بباتەوە. لەبەر ئەوە خۆی بۆ بەدەستهێنانی بروانامەی بەکالۆریۆس تەرخانکرد، کە ئەو کات تەمەنی ٢٩ ساڵ بوو. کاتێ لە ساڵی ١٨٣٨ زەمالەی سواردی ئەکادیمیای بیزانسۆنی وەرگرت، ئەمەش بواری بۆ رەخساند کە دوای خوێندنی باڵا بکەوێ، کە ئەو کات پیاوێکی تەواو کامل بوو. لە پایزی ١٨٣٨ رووی کردە پاریس، بە شێوەیەکی سەرەکی بەدوای وانەکانی کۆلیژی دی فرانس و قوتابخانەی هونەر دادەچوو.

لەساڵی ١٨٣٩ پرۆدۆن یەکەم کتێبی ناسراوی "دەربارەی ئاهەنگێران بە بۆنەی رۆژی یەکشەمەوە" بڵاوکردەوە. لە پاریس مایەوە تا کۆتایی ساڵی ١٨٤١، واتە تا ئەو ساتەی کە زەمالەی سواری لێ سەنرایەوە بە هۆی شوێنەواری ئەو مشتومرەی کە لەسەر بڵاوبوونەوەی کتێبی "موڵکایەتی چییە؟" لە ساڵی ١٨٤٠، کەوتەوە ئەو کتێبەی کە ناوبانگی دەرکرد لە جیهاندا. لە ساڵی ١٨٤٣ ز مارکس دەستیکرد بە ئاماژەدان بە کارەکانی پرۆدۆن، ئەمەش لەو وتارەی کە لە رۆژنامەی ریناینە دەینووسی "Reinishe Zeitung"، دوای ئەمە مارکس شەست پەرەی لە کتێبی "خێزانی پیرۆز" تەرخانکرد بۆ پرۆدۆن کە لە ساڵی ١٨٤٥ بڵاوکرایەوە، سەرەرای ئەوەی کە پێش دوو ساڵ نووسرابوو. لەو کتێبەدا مارکس دەڵێ:" کتێبەکەی پرۆدۆن "موڵکایەتی چییە؟ سەبارەت

بە ئابووری کۆمەڵایەتی هاوچەرخ، هەمان گرینگی ئەو کتێبەی سەیسی Sieyes هەیە(دەوڵەتی سێیەم چییە؟) سەبارەت بە زانستی رامیاری نوێ " ل٥٣ هەروەها " ئەم کتێبەی پرۆدۆن بەیاننامەیەکی زانستییە بە ناوی پرۆلیتاریای فرەنسییەوە دەدوێ ". ل٧١" یادنامەی یەکەم" دوای ئەویش "یادنامەی دووەم" کە دووکتێبی پرۆدۆن "بریتین لە چەند نامەیەك کە ئاراستەی. م .بلانکی برا گەورەی شۆڕشگێری بەناوبانگ کرا بوون لە ساڵی ١٨٤١، دواتر لە ساڵی ١٨٤٢ کتێبکی بلاوکردەوە بە ناوی "وریاکردنەوەیەك بۆ موڵکدارەکان". لە ئەنجامی بلاوبوونەوەی ئەم کتێبانە پرۆدۆن لە بەردەم دادگای تاوان "دۆبس" "Doubs" لە ساڵی ١٨٤٢ دادگایی کرا، بەڵام ئەم دادگاییکردنە بەبێ تاوان ئازادی کرد. ئەو وتارەی کە بۆ بەرگریکردن لە خۆی بەرامبەر ئەم دادگایە بەرزی کردەوە لە هەمان ساڵدا بلاوکرایەوە. کە بووە هۆی بێبەشبوونی لە زماڵەی سوارد لە هەمان کاتدا لە هەموو هۆکارەکانی ژیانیش بێبەشی کرد. بە هۆی ئەو هاوکێشە بەناوبانگەی کە دەڵێ "موڵکایەتی = دزی" کە وەکو بۆمبێك تەقییەوە و ناوبانگی تەواوی دەرکردو دووبارە بێ کار مایەوە. جارێکی تر برایانی گۆتییە لەو بارودۆخە ماددیە نالە بارە رزگاریان کرد و کردیان بە جێگری بەرێوبەری کارگەی گواستنەوە کە لە شاری لیۆن "Lyon" دایا نمەزراند بوو. لە راستیدا ئەم پۆستە هەم رێگای چوونی بۆ پاریس، بۆ خۆشکرد و هەم کاتێکی زۆری دەست بەتاڵی بۆ دەهێشتەوە.

ئەو دوو ساڵەی کە لەگەڵ برایانی گۆتییە بردیە سەر، دوو کتێبی بلاوکردەوە: یەکەمیان لە ساڵی ١٨٤٣ بەناوی "سەرهەڵدانی سیستەمی مرۆڤایەتی " و کتێبی دووەم کە لە دوو بەرگدا بلاوی کردەوە لە ساڵی ١٨٤٦ بەناوی "سیستەمی دژپێکە ئا بوورییەکان" کە بە "فەلسەفەی کلۆڵی" بەناوبانگ



بوو. مارکس و پرۆدۆن لەو مشتومرانەی کە لە ساڵی ١٨٤٤ لە پاریس لە نێوانیاندا روویدا هاوسۆز نەبوون. هەر لەم کاتەدا پرۆدۆن چاوی بە رۆژنامەنووسی ئەڵمانی کارل گرۆن و دوای ئەویش بە باکونین Bakuonine و هێزترن Hertzen ، کەوت.

لە ساڵی ١٨٤٥ لێکپچڕانێك لە نێوانی مارکس و پرۆدۆن روویدا، ئەمەش لە ئەنجامی رەتکردنەوەی ئەو بەرپرسیاریەتە. هات کە مارکس داوای لە پرۆدۆن کرد ببێتە نوێنەری رێکخراوی هاندان و پرۆپاگەندەی نێو نەتەوەیی کە مارکس هەوڵی بنیاتنانی دەدا، بەبێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێکی تیا بەدەست بهێنێ. کاتێك مارکس لە ساڵی ١٨٤٧ کتێبێکی بلاوکردەوە بەناوی "کلۆڵی فەلسەفە"، وەك رەتدانەوەیەکی "فەلسەفەی کلۆڵی" پرۆدۆن، لەو کتێبەدا هێرشێکی توندی کردبووە سەر کتێبی" دژپێکە ئابوورییەکان"، مارکس هەستی بە رق و قینێکی زۆر دەکرد بەرامبەر پرۆدۆن، ئەمە وایکرد کە مارکس بکەوێتە چەند هەڵەیەکی راڤەییەوە سەبارەت بە کتێبەکەی پرۆدۆن، ئەمەش غەدرێکی گەورە بوو لەو کتێبەکرا.

لە سەرەتای ساڵی ١٨٤٧دا پرۆدۆن بڕیاریدا کارەکەی لە لیۆن جێ بهێڵێ، بۆ ئەوەی لە پاریس کاری رۆژنامەوانی بکا. لەسەرەتادا رووبەڕووی هەندێ هەرەس و ژێرکەوتن بۆوە تاکو لە کۆتایی هەمان ساڵدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بە دامەزراندنی رۆژنامەی گەل "Lepouple" کە دواتر لەگەڵ نزیکبوونەوەی شۆڕشی ١٨٤٨ ناوی گۆڕی بە نوێنەری گەل " Le represenant". لە راستیدا پرۆدۆن کاتێك خۆی بە جێگری کۆمەڵەی نیشتمانی هەڵبژارد، نوێنەری راسنەقینەی گەل بوو. لە ماوەی ئەو هەڵبژاردنە بە شەکیانەی کە لە ٨ حوزەیرانی ١٨٤٨ ئەنجام دران، پرۆدۆن جوانترین گوزارشتکەر بوو لە چەپی پەڕگر لە ماوەی شۆڕشی ١٨٤٨، کە رەخنەی

توندی ئاراستەی تێکرای ئەو یاسایانە دەکرد کە حکوومەتی کاتی سەبارەت بە مەسەلەی دروستکردنی "پۆستگەی نیشتمانی" "دەری کردبوو، کە هیچ نەبوو تەنها" سڕکردنی پرۆلیتاریا نەبێت بە بێ ئەوەی مافەکانیان بۆ فەراهەم بکرێ ". لەبەر ئەوە پرۆدۆن نکۆڵی لە بوونی "هەر توانایەکی شۆڕش دەکرد لای حکوومەت".

لە کاتی چوونی بۆ کۆمەڵەی نیشتمانی، ڕووبەڕووی دژایەتییەکی توند بۆوە لەلای زۆربەی هاوڕێکانی کە بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی خۆی بە گاڵتەکردنەوە دەنووسێ و دەڵێ "ئەوان زۆر سەرسامبوون کاتێك کە بینیان من نە قۆچم هەیە نە چڕنووك". هەروەها لە نامەیەکدا بۆ براکەی ناردبووی دەڵێ " کەس ناتوانێ بەو کاریگەرییەی من قسە بۆ پرۆلیتاریا بکا". لە راستیدا پرۆدۆن هەرگیز بەچاوی گرنگیەوە تەماشای شۆڕشی ١٨٤٨ نەدەکرد، تەنها ئەو رۆژانەی کۆتایی حوزەیران نەبێ کە راپەرینێکی‌کرێکارانەی بە خۆوە بینی. ئاشکرایە کە ئەو بە دڵ لەگەڵ راپەریوەکان بوو، دەربارەی ئەمەش لە چەند نامیلکەیەکیدا" دەڵێ " هۆکاری راپەرینەکە خراپی ناوەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانی بوو... راپەڕینەکە ملکەچ کرا، بەڵام نەبەزی .... بەڵام بورژوازییە سەرکەوتووەکان وەکو پڵنگ دڕندەن".

ئەم بارودۆخە بووە لانکەی دانیشتنەکانی ٣١ تەمووزی ١٨٤٨ی کۆمەڵەی نیشتمانی کە پرۆدۆن خۆی وەسفی تەواوی ئەو دانیشتنانەی لە کتێبی" دانپیانانەکانی شۆڕشگێڕێك" ١٨٤٩ کردووە. یەکەمجار لە کۆمەڵەکەدا وتارەکەی بەرهەڵستکارییەکی لە نێوان پرۆلیتاریا و چینی بورژوا دروستکرد، پرۆدۆن جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە پرۆلیتاریا لە توانای دایە سیستەمێکی نوێ دابمەزرێنێ و هەستێ بە پرۆسەی پۆلینکاری لەو ئامرازە یاسایانەی کە رێگای پێ دراوە، کاتێك ئەمەی وت، بێزارییەکی ئاشکرا لە لایەن ئەندامانی



کۆمەڵەوە هەستی پێ دەکرا. بۆیە داوای دەنگدانیان دەکرد بۆ بڕیاردانی ئیدانەکردن و سەرکۆنەکردنی پرۆدۆن، بڕیارەکە بە ٦٩١ دەنگ بەکۆی ٦٩٢ دەنگ بردییەوە. پرۆدۆن لە "دانپیانانەکان" بەڵگەی بۆ هەڵوێستەکەی خۆی هێناوەتەوە، دەڵێ " ئامانج گەیشتە بە پاککردنەوە و پۆلێنکردنی پرۆلیتاریا بە شێوەیەکی ئاشتیانە لە لایەن یۆتۆپیاوە". "من لە چینی کارم دژی سەرمایە". پرۆلیتاریا تەنیایە و دوورە لە هەر شەرعییەت بوونێك، بە هۆی کارەکەی خۆیەوە بەبێ هیچ ناوەندێکەوە، دەتوانێ شۆڕشی ئابووری جێ بەجێ بکات".

بێگومان لێرەدا هەست دەکرێ بە نزیکی نێوان هەڵوێستی پرۆدۆن و ئەو رستەیەی لە بەیاننامەی شوعیەتدا هاتووە کە لە ساڵی ١٨٤٨ نووسراوە، کە هەرگیز پرۆدۆن نەیخوێندۆتەوە رستەکە دەڵێ "رزگارکردنی کرێکاران دەستکردی خودی کرێکاران خۆیانن".

لە راستیدا نابێ هەرگیز سەرسام بین کاتێك دەبینین پرۆدۆن لە "دانپیانانەکان" ناڕەزایی دەربڕیوە و دەڵێ" "من پێم وانە بوو کە نموونەی ئەم دژایەتیکردنە ببینم: کە گاڵتەیان پێم کرد، ناشرینیان کردم، سەرکۆنەیان کردم، لێم تۆرە بوون و نەفرەتیان لێم کرد، بە هەموو رق و تورەییانەوە دوژمنایەتیان دەکردم)). بۆیە نابێ سەرسام بین کاتێ دەبینین مارکس لە "مقطوعتە تأبینیة" کە تایبەتی کردبوو بە پرۆدۆن دەڵێ "... هەڵوێستی پرۆدۆن لە کۆمەڵەی نیشتمانیدا تەنها شایانی رێزگرتن و پیاهەڵدان بوو، ئەم هەڵوێستە لە ئازایەتییەکی مەردانەوە سەرچاوەی گرتبوو، هەروەها ئەم هەڵوێستە ئەنجامێکی دڵخۆشکەری لێکەوتەوە کاتێك بینیمان بەرێز "تییر" وەڵامی پێشنیارەکانی پرۆدۆنی دایەوە" ئەو وەڵامدانەوەیە لە شێوەی کتێبێك بوو "کە

ئەو بنکە ساویلکانەیەی ئاشکرا دەکرد کە رۆشنبیری تایبەت بە بورژوازی فرەنسی لەسەر بوونیات نرابوو".

ژیانی پرۆدۆن لە سەردەمی ناپلیۆن پۆنابرت چۆن بوو؟ کاتێك لویس لە١٠ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٤٨ بە سەرۆك کۆماری هەڵبژێردرا بە پێی ئەو یاسایەی کە کۆمەڵی نیشتمانی دانابوو، پرۆدۆن دژایەتی خۆی بەرامبەر بەویاسایە دەرخست.

دوای هەڵگەڕانەوەکەی ٢ کانوونی یەکەمی ١٨٥١، سەرۆك خۆی کردە ئیمپراتۆر، بە درێژای ئەو ماوەیە پرۆدۆن لە لێدوانەکانیدا لە رۆژنامەی"دەنگی گەل" بێ دەنگ نەبوو، دەیوت"لویس پۆناپرت گەورەترین و سەر سەخترین دوژمنی دیموکراسی و سۆسیالیستی و پرۆلیتاریایە. لە زستانی ١٨٤٨ــ ١٨٤٩دا پرۆدۆن لە وتارە توندوتیژەکانیدا هێرشی توندی دەکردە سەر لویس، تا لە ئەنجامی ئەمەدا دیسانەوە بردیانە بۆ بەردەم دادگا و دادگا سزای سێ ساڵ زیندانی دا. بەڵام پرۆدۆن بۆ بەلجیکا رایکردو لە وێ مایەوەك بێ دەنگ بوو دواتر بە رێگای یاسایی گەڕایەوە فرەنسا و بە گەڕانەوەکەی زانرا گرتیان و سێ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنرا لە ٧ی حوزەیرانی ١٨٤٩ تا ٤ حوزەیرانی ١٨٥٢ لە بەندیخانەی سانت بیلاجی زیندانی کرا.

کەواتە هەستی پرۆدۆن بەرامبەر بە لویس دەبێ چۆن بێ؟ "نامیلکەکانی" هیچ گومانێکمان لەو بوارە بۆ ناهێڵێتەوە. کە لە کانوونی یەکەمی ١٨٥١ دەڵێ "لویس تەنها سەرکێشێکی بێ تامە کە لە کەشێکی وەهمانەی گەلدا هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی دەست بگرێت بەسەر تواناکانی جەماوەردا، بۆ ئەمەش سوودی لە ناکۆکییە مەدەنییەکانی ئێمە وەرگرت. چەقۆی خستە ئەستۆمان بۆ رازیبوونمان بەدەست درێژیکردنە سەر دەسەڵات. پاریس لەو رۆژەدا وەك



گیرۆدەیەك وابوو کە لە لایەن دزێکی چەپەڵەوە دەست درێژی کرابێتە سەر ".
دوای مانگێك پرۆدۆن دیسان دەڵێ " کوری زیناکەرێکی خوێن رێژ، جۆزیفی کور و نەوەی سۆزانییەك و کلۆلێکی بێ توانای لە دوای خۆی جێهێشت... وەمەش تەنها هیچ و پوچێکە کە پێی دەڵێن پۆناپرت، ئاه... ئەی ترسنۆکەکان! ئەی فرەنسییە ترسنۆکەکان! باشترین رێگا بۆ رزگاربوونتان لە لویس پۆناپرت تەنها کوشتنییەتی. من ئەو کەسەم خۆش دەوێ و خۆشەویستر و گەورەتر دەبێ لەلام کە بتوانێ بیکوژێ " (نامیلکەکان، ٢٧ــ ٢٨ شوباتی، ١١ ئازار ١٨٥٢). لە راستیدا هەڵگەڕانەوەکەی ٢ کانوونی یەکەم، راگەیاندنی ئیمپراتۆر ئازارێکی سەختی پرۆدۆنی دا. ئەمەش وای لێکرد کەوا بیربکاتەوە کەسێك کت و پڕ بڕیاری کوشتنی دەدا، بەڵام ئەمە لە دیدگای تایبەتی خۆییەوە نەبوو، بەڵکو لە پێناو ئەو کێشەیە بوو کە بەردەوام هەوڵی بۆ دەدا، هەرچەندە لە ماوەی ئەو پێنج ساڵ و نیوەی لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٥٢ لە بەندیخانە گەڕابۆوە کەس دەستی لێ نەدا، تا لە ساڵی ١٨٥٨ کتێبێکی چوار بەرگی بڵاوکردەوە دەربارەی" دادپەروەری لە شۆڕش و کلێسا" دا، تاکو دوبارە فەرمانی چەند ساڵێك زیندانی بەسەردا درایەوە و کتێبەکەی قەدەغەکرا. دیسان بەرەو بەلجیکا هەڵات و چوارساڵ لەوێ مایەوە"١٨٥٨ــ١٨٦٢" لە ساڵی ١٨٦٢ کۆتایی بەدوور وڵاتییەکەی هێناو بەسوود وەرگرتن لەو بەخشینەی کە پێش ساڵێك بۆی دەر چووبوو.

بەم شێوەیە پرۆدۆن هەموو ژیانی لە دوور وڵاتی بردەسەر، تەنها دوو ساڵ و نیو پێش مردنی نەبێ.

کەواتە ئەم چیرۆکە ئەفسانەیانە لە کوێوە هاتوون کە هەندێ جار لەلایەن دوژمنانی پرۆدۆنەوە بەکارهێنراون کە دەیانوت پرۆدۆن لە سەردەمی ئیمپراتۆری دووەمدا رەوشتی سیاسی دوولایەن و لێڵ بووە، لە راستیدا ئەم

قسانە پشتیان بە چەند رستەیەك دەبەست كە بە خراپی راڤەكرابوون. یەكەم ئەو گفت و گۆیانەی كە پرۆدۆن لەگەڵ سەرۆك جیرۆم سازیدا، كە ئامۆزا و جێگری ئیمپراتۆر بوو بە هەندێ بیروباوەڕی دژی "لاكلیرۆس" و بیروباوەڕی كۆمەڵایەتی پێشكەوتوو لە بیروباوەڕەكانی ناپلیۆنی سێیەم، دەستی پێكرد. هەرچەند ئەو گفتوگۆیانەی كە بۆ سەرۆك جیرۆم دەست پێشخەری تێدا كرد هیچ بەرەنجامێكی نەبوو. دواتر هەندێك پێیان وایە كە پرۆدۆن بە هۆی ئەو نامەیەی كە بۆ ئیمپراتۆر ناردی توانی نارەزایی دەربڕێ لەسەر قەدەغەكردنی كتێبەكەی " شۆڕشی كۆمەڵایەتی كە هەڵگەڕانەوەكەی، كانوونی یەكەم چەسپاندی" ١٨٥٢. لە راستیدا ئیمپراتۆر دوای ئەوەی نامەكەی پێ گەیشت، یەكسەر بڕیاری قەدەغەكردنی كتێبەكەی لابرد. لەگەڵ ئەوەشدا پرۆدۆن هەرگیز كۆڵی نەداو و وازی نەهێنا، لە بانگەوازی ئەوەی كە ئەو دوژمنێكی سەرەكی سیاسەتەكانی سیستەمە، بۆیە دەڵێ" هەرگیز تیاتاندا دروست نەبوو هەرگیزیش تیاتاندا دروست نابێ ... دوژمنێك لە من بە تواناتر و چالاكتر" (چاپی ریفیر، ١٩٣٦ ل١٤٧). لە راستیدا پرۆدۆن هیچ دڵنیایەكی نەدابوو بە لویس ناپلیۆن، بە تایبەتی لە رێگای ئەو رستە روونەی كە تێیدا بلاویكردەوە، كە ئیمپراتۆر"بەرەو لە ناوچوون دەچێ ئەگەر وەك بریكاری شۆڕشی كۆمەڵایەتی و فەرمانبەرێكی دەسەڵات هەڵسوكەوت نەكات". پرۆدۆن بۆ كارە یاساییەكانی خۆی دەبوایە رووبەڕووی كەسێك ببوایەوە كە تاسەر ئێسقان رقی لێدەبۆوە و ئارەزووی كوشتنیشی دەكرد، لە راستیدا پرۆدۆن ئەم نامەیەی بە نامەیەكی "میكاڤیلیانە" دادەنا، بەوەی كە لەنامیلكەیەكدا پوختی كرۆتەوە دەڵێ " لە ئاودانی سیاسەت واتا سووربوونی دەست لە چەپەڵیدا".

هەرچەند پرۆدۆن رووگیرێكی منجڕ و فێڵبازێكی سیاسیش نەبوو، بەڵكو بە پێچەوانەوە هەرگیز میكیاڤیلی لەگەڵیدا هەڵی نەدەكرد و نە دەگونجا. بۆ



ئەوەی زیاتر ئەم مەسەلەیەمان لە لارروونتر بێ دەبێ خوێندەوەیەك بۆ كتێبە قەدەغەكراوەكەی بكەین، ئەو كتێبەی كە بە فێڵی ئاشكرا رازێنرابۆوە. ئەم فەرمانەش تەنها  ئەم كتێبەی ناگرێتەوە، بەڵكو ئەو كتێبەی پێشووش دەگرێتەوە كە پرۆدۆن لە ساڵی ١٨٥١ لە بەندیخانە نووسیبووی بە ناو نیشانی "بنەمای گشتی بۆ شۆڕش لە سەدەی نۆزدەمدا"، لەو كتێبەی دواییاندا پرۆدۆن پێشنیاری "رێكەوتنی نێوان پرۆلیتاریا و چینی ناوەڕاستی كرد بۆ لە ناوبردنی سەرمایەداری "و" جێبەجێ كردنی شۆڕشی كۆمەڵایەتی". بەڵام بەپەلە بیروباوەڕە كۆنەكانی گەڕاندەوە، بۆ ئەوەی لە نووسینی " فەلسەفەی پێشكەوتندا "پشتی پێ ببەستێ، كە دواین كتێبی بوو لە بەندیخانەدا لە ساڵی ١٨٥٣ نووسی، كە دەربارەی "وزەی شۆڕش بوو لەلای جەماوەری كرێكاری "لە پێناو لەناوبردنی رێبازی كۆنەپەرست و "دەرەبەگایەتی پیشەسازی".

پرۆدۆن پشتگیری ئەو گەڕانەوەی دەكرد بۆ هەڵوێستە شۆڕشگێرییەكان "لە پێشەكییەكی نوێ"و لە" دەرئەنجامی گشتی" كتێبی "پەراوی تێڕامانەكان" كە چاپی سێیەمی لە چاپی سێیەمی لە ساڵی ١٨٥٧ لە پاریس لە چاپخانەی برایانی گۆتیە چاپی كرد، بەشێوەیەكی بنەڕەتی چاكسای تێدا كردبوو. لە ساڵی ١٨٥٧ كە لەپاریس لە چاپخانەی برایانی گۆتییە چاپی كرد بەشێوەیەكی بنەڕەتی چاكسازی تێداكردبوو، بەڵام دوو چاپەكەی پێشوو جێگای چاپكردنیان دیار نییە، كە لە ساڵانی ١٨٥٤ و١٨٥٥ بڵاوكراونەتەوە وە ئەو دەقە بەرزانەی كە لە سەری قسەی كردووە ئاماژەی پێداوە لە ساڵی ١٨٥٦ نووسراون، پرۆدۆن هەستاوە بە دروستكردنی چەند بەرهەڵستكارییەك لە نێوان قۆناغەكانی سەرمایەداریدا:

أ ـ قۆناغی گێرەشێوێنی پیشەسازی.

ب ـ قۆناغی دەرەبەگایەتی پیشەسازی.

ج ـ قۆناغی ئیمپراتۆرییەتی پیشەسازی، "کە بەلوتکەی تەنگانەکە دادەنرێ "هەروەها بە" خاڵی جیاکردنەوەی نێوان پرۆسەی مژینی سەرمایەداری بانکی و پشت بەستو بەباج دادەنرێ "وەکو چۆن پێشتر" قەیسەری ئابووری وا پێناسە دەکرا.

لێرەدا پرۆدۆن پەردەی لە رووی رەوشتی ئۆتۆکراتی و زۆرداری ئیمپراتۆرییەتی دووەم لادا، بۆیە بەبێ چاوپۆشی رۆڵی دەستپێشخەری سەرمایەداری رێکخراوی دەرخست، ئەو رۆڵەی کە پرۆدۆن بە هێزێکی واقعییەوە هەڕەشەی لێدەکرد، کە لە هەمان کاتدا کە ترسی فاشییەتی بەڕێوەبەری بەرێوەیە.

د- ئەو قۆناغەی کە دیموکراسی پیشەسازی دێ بۆ کۆتایی هێنان بە سەرمایەداری. ئەم دیموکراسییەش جێگیر نابێ تەنها لە رێگای شۆڕشی کۆمەڵایەتییەوە نەبێ، و پێویستە کرێکارەکان خۆیان کارەکان جێبەجێ بکەن، ناوەڕۆکی موڵکایەتی و ئامرازەکانی سەرەوژێر بکەن و لەم دیموکراسییەدا چارەسەری تەنگانەکە دەردەکەوێ، بەڵام بە زۆرلێکردن بۆ کاری کۆمەڵانی نامەرکەزی.

ئەمەش بەرنامەی ژیان و تەواوی کارەکانی پرۆدۆنە، کە قۆناغی پێگەیشتنمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەتایبەت لە کتێبە سەرەکییەکەی دەربارەی" دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسا" ساڵی ١٨٥٨، هەرچەندە کتێبەکە تایبەتە بە چەند بارودۆخێك، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرۆدۆن هەموو بیروباوەڕەکانی خۆی تێدا دەخاتەڕوو.



لە ئایاری ١٨٥٥دا، نووسەرێکی کاسۆلیکی راسترەو کە پێیان دەگوت أ. دی میریکور، هێرشێکی دژی پرۆدۆن دەستپێکرد، کە بریتی بوو لە بلاوکراوەیەك پڕ لە هەڵە و درۆ، لەگەڵ ئەوەشدا نامەیەکی لە قەشەی بیزانسۆن کاردینال ماثیو پێ گەیی. دوای دوو دڵییەکی درێژ، پرۆدۆن بریاری دا وەڵامی ئەو بلاوکراوەیە بداتەوە. ماوەی وەڵامدانەوەکەش سێ ساڵی خایاند، کە بەیەکێك لە کتێبەکانی نووسەر دادەنرێ، کە دواتر بوو بەرێبازێك دژی لاکلیرۆس لە فەرەنسا. لەم کتێبەدا هەموو ئەو بەڵگانە خرابووە ڕوو کە دانراوی ئەوکەسانە بوون کە لەسەروەی کۆماری سێیەمدا، داوایان دەکرد دەوڵەت لە کلێسا جیابکرێتەوە. هەروەك چۆن رادیکالییە سۆسیالیستەکان و سۆسیالیستە سەندیگاکان، و دوای ئەوانیش شیوعیەکان، بەکورتی هەموو عەلمانییە فرەنسییەکان، ئیلهامیان لێ وەرگرت. کتێبەکە بەگشتی بەئینسکلۆپیدیایەکی حەقیقی دەچوو لە بیری فەلسەفی و کۆمەلایەتی و سیاسی پرۆدۆندا، بەوەی کە ئامانجەکەی خۆی تێپەڕاندووە کە دەبو بۆی بنووسرایە.

کاتێك کە ناچارکرا بۆ ماوەیەکی درێژ لە دوورە ولاتی لە بەلجیکا بمێنێتەوە، کە لە دەستی دەسەلاتی یاسایی نوێ هەلاتبوو و بلاوکردنەوەی کتێبەکانی قەدەغەکرابوون، پرۆدۆن لە بەلجیکا هەستا بە پوختکردنی کتێبەکانی دوایی. بەم جۆرە لە بەلجیکا لە ساڵی ١٨٦١ کتێبی"جەنگ و ئاشتی" نووسی، ئەمەش کۆمەلێك دەنگە دەنگی دروستکرد. لە راستیدا هەندێك پێیان وایە پرۆدۆن لەم کتێبەدا جەنگی پیرۆزکردووە، بەڵام لەڕاستیدا تەنها بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە جەنگ لە هەموو کۆمەڵگاکان هەمان روخساری نییە، لە سیستەمی سەرمایەداریدا شێوەی رکابەرێ وەردەگرێ، بەلام دواتر سەر دەکێشی بۆ ململانێی چینایەتی.

كاتێك پڕۆدۆن لە دورخراوەیی گەڕایەوە، گرنگییەكی زۆری بە "فیدرالی" " Federa lisme " دەدا، كە پێشتر ئەو مەسەلەیەی وەك پابەندییەك بەمەسەلەی دیموكراسی پیشەسازی خستبووە روو. سەرەڕای ئەو گرنگییەی كە بە فیدراڵی دەدا، بەڵام بەهۆی ئەو گفتوگۆیانەی كە سەبارەت بە یەكێتی نەتەوەی ئیتاڵی ئەنجام دەدرا پرۆدۆن رقی لەو یەكێتەیە"فدرالییە" هەستا، ئەم رق لێبونەوەیەشی بووە هۆی ئەوەی دیموكراتییەكان و قەیسەرییەكان قێزیان لێ ببێتەوە. كاتێك لە كەنارە بێ دەنگ و دوورەكەی"باسی" جێگیربوو، هەولێدا گۆڤارێك دەربكا بەناوی"یەكێتی"یا"فیدرالییەت"، بەڵام وەزارەتی ناوەخۆ رێگای دەرچونی نەدا. لەبەر ئەوە پرۆدۆن لە ساڵی ١٨٦٣ كتێبە نوێیەكەی بلاوكردەوە دەربارەی "بنەمای فیدراڵی و پێویستی دووبارە پێكهێنانەوەی پارتی شۆڕش". ئەو كتێبە رووكەشێكی گفتوگۆیانەی هەبوو، چونكە پرۆدۆن وەڵامی ئەو هێرشانەی دابۆوە كە لە رۆژنامەكاندا كرابوونە سەری، لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوەڕۆكدا گرنگییەكی زۆری هەبوو، چونكە پابەندییەكی زۆری هەبوو بەبیروباوەڕەكانی پرۆدۆنەوە. پرۆدۆن لەم كتێبەدا جەختی كردبووە سەر ئەوەی" سەدەی بیست، سەدەی كرانەوەی فیدرالییەت و یەكێتیە". جێبە جێكردنی ئەم فیدرالییەش كاری پرۆلیتاریایە..." ئەوەی بە ئازادی دەوترێ ... بە فیدراڵی دەوترێ ... ئەگەرنا وەك ئەوە وایە هیچ نەوترابێ ".". هەموو ئەو بیروباوەڕە ئابووریانەی كە ماوەی بیست و پێنج ساڵە چاكسازیم تێدا كردوون، دەتوانم لەم سێ وشەیەدا كورتی بكەمەوە: یەكێتی كشتوكاڵی _ پیشەسازی. هەروەها هەموو تیۆرە سیاسییەكانم دەتوانم لەم هاوكێشەیەدا كورت بكەمەوە: یەكێتییەكی سیاسی یا داماڵینی مەركەزییەت". مولكایەتی ئەگەر لە رێگای پۆلینكاری سیستەمی سەرمایەداریدا لە خراپییەكانی پاك بكرێتەوە بۆ خۆی دەبێت بە



مولكایەكی یەككگرتوویی. بریتییە یە لە مولكایەتییەكی سنووردار كە پەیوەستە بەو هاوسەنگییە ئالۆزانەی نێوان مولكدارەكان، ئەوانەی لە هەمان كاتدا یەكێتییەكی پیشەسازی كشتوكالین، هەموو لقێك لە لقەكانی پیشەسازی و هەموو ناوچەیەك تا ئاستێك و هەموو كۆمەڵە بەرهەمهێنەكان و هەموو كرێكارەكان، بەجیا تەماشا دەكرێن. پرۆدۆن ئەم مەسەلەی بە درێژییەوە لەكتێبەكەیدا چارەسەركردووە، وەك بەشی دووەمی كتێبی "بنەمای فیدراڵی" دایدەنا، بەڵام تا ساڵی ١٨٦٥ بلاو نەكرایەوە، واتا دوای مردنی پرۆدۆن، بەناوی "تیۆریی مولكایەتی" یەوە.

لە ماوەی ساڵەكانی كۆتایی ژیانیدا، پرۆدۆن كاری لەسەر كتێبێك دەكرد، كە دەتوانین وەكو ئامۆژگارییەك تەماشای بكەین، كە ئەو بیریار و تێكۆشەرە لە دوای خۆی جێهێشت، كە "دەربارەی توانای سیاسی بوو لای چینی كرێكار". كتێبەكەی زۆر نایابە، بە تایبەتی بەشەكانی كۆتایی كە هیوای پرۆدۆن زۆربێ هێزە، لە مردن نزیكترە وەك لە ژیان. ئەو كتێبە دواتر بوو بە ئینجیلێك بۆ بزووتنەوەی كرێكاری فەرەنسی، لە سەردەمی خۆشیدا پڕترین خوێنەری هەبوو لە چاو كتێبەكانی تریدا لە ناو چینی كرێكاردا. وەكو چۆن نوێنەری لقی فەرەنسی لە "نەتەوە یەكەمینییەكان" و دواتر تیۆرزانەكانی سەندیكای شۆڕش، ئیلهامیان لێ وەرگرت بۆ نموونە "بیلوتییە، و گریفولس و سوریل".

یەكەم شت كتێبەكە وەڵامێكی توند بوو بۆ "بەیاننامەی كرێكارانی سین ستین"، كە ژمارەیەك لە پرۆدۆنییە میانڕەوەكان نووسیبویان، بەیاننامە كە داوای كاندیدای كرێكاری سەربەخۆی دەكرد لە هەڵبژاردنی یاسا دانان. بەڵام پرۆدۆن لەلایەنگرانی بەشداری نەكردن بوو لە هەڵبژاردنەكان، ئەمەش نەك تەنها لەبەر ئەوەی وای دەبینی كە پێویست ناكات پرۆلیتاریا لە ژێر دەسەڵاتی سەرمایەداریدا كاربكەن، تەنها بەهۆی رێكخستنی تایبەتیانەوە نەبێت بۆ

ئەوەی بتوانن خۆیان ئامادەبکەن بۆ شۆڕشی کۆمەڵایەتی، و بانگەوازی "مومارەسەی جیابوونەوەی" دەکرد کە پێی وابوو کاراترین چەکی دەستی پرۆلیتاریایە "کە ئامانجیان ئەوە بووە .... وەکو بورژوازییەکانی ساڵی ١٧٨٩ لە هەندێ شتەوە بێن بە هەمووشت". ئەم "جیابونەوە رەهایە" سەبارەت بە بورژوازەکان سەرەتای کۆتایی بوو کە رۆڵی مێژوویان کۆتایی هاتووە. بەم جۆرە پرۆدۆن تا دواساتەکانی ژیانی بە شۆڕشگێری مایەوە، بەڵکو لە هەندێ چالاکی دیاری کراوەوە، لە مارکس شۆڕشگێڕتر بوو، کە لە کتێبەکانی دواییدا زیاتر لێی نزیك بوو.

بەم جۆرە بەپەلە باسمان لە ژیانی پرۆدۆن و هەندی واقیعی بەرزی ژیان و هەروەها هەندێ هەڵوێستی سیاسی کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری لەسەر دوا رۆژی هەبوو، کرد. هەرچەند پرۆدۆن زانایەکی کۆمەڵایەتی و لە هەمان کاتدا فەیلەسووف و تیۆریستێکی سیاسیش بوو. ئێمە لەم چەند لاپەڕەیەدا تەنها دەتوانین ئاماژەیەکی کورت بە پەرەسەندنی بیروباوەڕی بکەین، بەلام ئێستا هەوڵ دەدەین هەموو روخسارەکانی ئەم بیریارە دیاری بکەین، ئەمەش لە و بەشانەی کە تەرخانکراون بۆ ئەو سامانە هزرییەی کە پرۆدۆن بۆی جێهێشتوین.



## فەلسەفەی پرۆدۆن

### ١ـ فەلسەفەی کۆمەڵایەتی پرۆدۆن:

پرۆدۆن فەیلەسووف و کۆمەڵناس لە هەمان کاتیشدا تیۆریستێکی"منظر" کۆمەڵایەتی ـ سیاسیش بوو، ئەم سێ روخسارە کە لە بیرکردنەوەی پرۆدۆندا جیاناکرێتەوە، دەتوانین لە "فەلسەفەی کۆمەڵایەتیدا یەکانگیریان بکەین. هەر چەند بەم جۆرە جەختکردنە رەنگە ستەم لە هەلوێستە قوڵ و رەسەنەکانی پرۆدۆن بکەین: لەراستیدا ئەم تیۆریستە سروشتی خۆی لە رێگای دیدگایەکی دیارکراوادا بۆ هەمە جۆرکردنی جیهانێکی ناکۆتایی و نا جێگیر خستەڕوو: جیهانی کۆمەڵایەتی و جیهانی رەوشتی و جیهانی ماف، بەکورتی جیهانی حەقیقەت، هەموو ئەم جیهانانە پشتی بەستبوون بە "فرەییەك کە چەند رەگەزێك دەگرێتەوە ناکرێ لێکیان هەڵوەشێننەوە".

"واقیع بە سروشتی خۆی ئالۆزە، ساکاریش لە میسالییەتەوە سەرچاوەی نەگرتووەو هەرگیزیش ناگات بە بەرجەستەبوون، لە "دەربارەی بنەمای فیدراڵی، چاپ ریفیر ١٩٥٩، ل٢٨٧". بۆ ئەوەی بەدرێژی پەی بە جوڵەی واقیع ببەین، رێگایەکمان نییە تەنها رێبازی دیالێکتێکی "دژکاری" نەبێ، کە هەموو پێکهاتە هاوسۆزییەکان رەت دەکاتەوە. هەرچەند واقیعی کۆمەڵایەتی یا واقیعی مرۆیی بە شێوەیەکی فراوانتر دەبێ لە چوارچێوەی بزاوتی دیالێکتێکی بێ کۆتایی تێبگەین. بەڵام بۆ ئەوەی بە دوای خواروخێچی (کۆکردنەوەکانی) و (جیاکردنەوەکانی) پرۆدۆندا بچین پێویستە پەنابەرینە بەر جۆرێك لە دیالێکتێکی ئەزموونگەرایی Empirisme. هەرچەند پرۆدۆن

بچوایە ناو تەمەنەوە، زیاتر ڕووە و ئاڕاستەی پراگماتیکی واقیعی لە فەلسەفەدا دەرۆیشت، هەرچەند وای دەرخست کە کۆمەڵناسی ڕێژەگەرایی سەرپەرشتیاری فەلسەفەیە (لەمەش ئامانجێکی دیاریکراوی هەبوو کە دیالێکتێکی کۆمەڵگاو دەستەو چینەکان بوو)، بەڵام فەلسەفە لەلای ئەو دەبوو بەرێبازێکی روون بۆ کۆمەڵناسی. رێبازی دیالێکتیکی ئەگەر لە فەلسەفە جیابکرێتەوە ئەوە پێش فەلسەفەو هەموو مەعریفەکانی تر دەکەوێ، چونکە پێشینەیی کاری مرۆڤ ئاشکرا دەکا. لەگەڵ ئەوەی پرۆدۆن کە تیۆریستێکی کۆمەڵایەتی سیایش بوو، بەڵام بەوەندە وازی نەدەهێناکە بەدوای "هاوسەنگییە دژەکاندا بگەڕێ کە لاسەنگ دەبن بێ ئەوەی دژکارییەکە بزربێ"، بەمەش پرۆدۆن مل کەچی عەقڵە سەرەتاییەکان دەبوو کە نەیتوانی بەیەکجاری لێیان دەرباز ببێ. لەراستیدا ئەو تێکۆشانە بەردەوامەی نێوان پراگماتیکی و عەقلانی، ئەزموونگەرایی وگەڕان بەدوای هاوسەنگییەکاندا کە کەمتر جێگیردەبوون، کلیلی هەموو ئەو هەوڵە زهنیانەی پرۆدۆنی حەشارداوە. لێرەدا ئەو ناخۆشیە راستگۆییە لە رووبەڕووبوونەوەی دژکارییەکان دەدۆزینەوە کە بوونی لە بزاوتی واقیعەکان و لە سێبەری فکرێکی تایبەت ئاشکرا دەبێت، ئەم فکرە بە وێنەیەکی تایبەت راکێشەرە، بەڵام هەندێ جار پەی پێ بردنی ناخۆشە. لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین پرۆدۆن "باسکاڵی کۆمەڵایەتی" بوو، وەکو چۆن کاتێك بەرەوشیکردنەوەی رەخنەیی تیۆرەکان چوو، بوو بە "دیکارتی کۆمەڵایەتی".

ئەگەر مەسەلەکە ئاوالاسەنگ بێ کە پرۆدۆن دیدگا یەکەمینەکانی بۆ جیهان کۆکردۆتەوە، پێش ئەوەی فەلسەفە بخوێنی، سەرچاوەی ئەم پەروەردە فەلسەفییەش دۆزینەوەی گران نییە. لەنامەیەکدا کە بۆ تیسۆی وەرگێڕی "رەخنەی عەقڵی پوخت" ناردبوو، تێیدا دانی بەوەدا ناوە کە ئەو "رۆژانە کانتی



دەخوێندەوە". پرۆدۆن وەك کانتیە دیارەکان لەرێگای شیکردنەوەی دژکارییە شارەواکان گرنگییەکی زۆری بە"کانت" دەدا. پرۆدۆن هەرگیز بەگومان نەبووە لە"هۆشیاری باڵا" و ئەو وتانەی کە "کانت" پێشتر باسی کردبوون.

"لەسەرهەڵدانی سیستەم لەلای مرۆڤایەتی"، ١٨٤٣، پرۆدۆن تێبینی"ئەو رێگا داخراوانەی کرد بوو، کە رەخنەکانی کانت بیری بۆی دەچوو" "چاپی ریفیر ل٢٦٢". پرۆدۆن لە کتێبە سەرەتاییەکانیدا ئاماژەی بەوەداوە کە ئەو بە پێچەوانەی هیگڵ لە دیالێکتێك گەیشتووە. دەربارەی ئەمە دەڵێ "کاتێك کە ناوی هیگڵم بیست، من تەواوی سیستەمی فکری خۆم دارشتبوو" "هەمان سەرچاوە ل٢١٢". کەواتە پرۆدۆن پێش ئەوەی چاوی بە مارکس و گرۆن و باکۆنین ... هتد بکەوێ، چۆن دەربارەی هیگڵ شتی بیستووە؟. بێگومان ئەمەش لە رێگای ئاهرنزبوو لە کولیژی دی فرانس. ئاهرنز کۆچەرێکی ئەلمانی بوو کە قوتابی کراوسی فەیلەسووف بووە، لە ژێرکاریگەری بیروباوەڕکانی فیختە بووە. هەروەها لە ساڵەکانی ١٨٣٤ـ١٨٤٢ لە کۆلیژ مێژووی فەلسەفەی ئەلمانی خوێندوە. ئەشێ پرۆدۆن لە ساڵەکانی ١٨٣٨ـ١٨٤١ قوتابی ئەو بووبێ. ئاهرنز بیروباوەڕە مێژووییەکانی خۆی لە ساڵی ١٨٣٦"چەند وانەیەك لە زانستی دەروونناسی" بڵاوکردەوە، "بەشی یەکەم ل٤٧ـ١٣٢. دواتر لە کتێبێك بەناوی "چەندوانەیەك لە مافی سروشتی" "چاپی دووەم، ١٨٤٢. ل٣٥٦، ژمارەی ٣"، بەهاوسۆزییەوە باسی کتێبە سەرەتاییەکانی پرۆدۆنی کردووە، دوای چەند ساڵێك برادەرێکی پرۆدۆن کە قوتابیی خۆیشی بوو بە ناوی "داریمون" کتێبێکی خۆی بە دیاری دایە ئاهرنزکە لەسەرکراوس نووسیبووی. هەرچەند ئاهرنز بەتوندی هێرشی کردبووە سەر سیستەمەکەی هیگڵ کە لە رووبەڕووبوونەوەکەیدا دیالێکتێکی فیختە و کراوسی دانا" "ئەو دیالێکتێکەی کە رێگایەکە بۆ هێنانەوەی گۆمانێکی" حدس" گشتگیر "گومانی

ئەزموونگەرایی" پێدراوەکانی هەمیشە فرەیین. لە لایەکی ترەوە کراوس و ئاهرنز کە چەمکی" میسالیەت- واقیعییەت" یان پوختکردەوە و دواتر پۆردۆن لێی وەرگرتن و مانایەکی نوێی پێدا.

بەڵام لێرەدا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو رەخنانەی کە پرۆدۆن رووبەڕووی هیگڵی کردبوونەوە، پێشتر لە کتێبی "دروستکردنی سیستەم" پرۆدۆن هیگڵی بە ئایدیۆمانیا "نەخۆشی وشك باوەڕی" تۆمەتبارکردبوو، کە وەك پێشتر هەریەك لە ئەفلاتوون و مالبرانش بەهەمان شت تۆمەتبارکرابوون "هەمان سەرچاوە ل١٥٦و ل٨٧ـ ل٨٩"، پرۆدۆن نارەزایی دەربڕیبوو دژی ئەو پەیوەندییەی کە هیگڵ هەوڵی دەدا جێگیری بکا لە نێوان دیالێکتێك و رۆحانییەت، پرۆدۆن دەیوت" ئەم تیۆرە بە شێوەیەکی بنەڕەتی بێ هێزە، چونکە چەمکەکانی "مفاهیم" پێش عەقل خستووە و عەقڵی دوای چەمکەکان خستووە، وەك چۆن سێبەر دوای جەستە دەکەوێ، ئەم چەمکانەشی لە رێگای دەستکەوتنی روخسارەکانی بەپێش هەموو تێروانینەکانی خۆی خستبوو "ه .س .پ ل٢٦٢". هیگڵ لە بری ئەوەی بە واقیع بگا پێش واقیع کەوتبوو" "ه . س . پ ل١٦٣"." سیستەمەکەی "منظومة" هیگڵ بۆ بیروباوەڕی سێینەی بەرەوی پەیداکرد، بەوپێیەی شیکارییەکان و "حلولیون" میسالییەکان و ماددییەکان گۆران بۆ سێینەیی "ثالوثين"، زۆرکەس وایان خەیاڵ دەکرد کە نهێنییەکی مەسیحییە و لە رێگادایە بۆ ئەوەی ببێ بەشتێکی ئاسایی "ه . س . پ ل٢٦٢". لە لایەکی ترەوە بە نەگەیشتنیان بە دیالێکتێکی نێگەتیڤ و ئەزموونگەرایی. پرۆدۆن پێشتر تێبینی کردبوو کە "سیستەمەکە بەتەواوی لەناو ناچی، بەڵکو بە شێوەی تیۆرەو دژەکەی "ه . س . پ .ل٢١٤. بە شێوەیەکی گشتی سەیرە کە دەبینین ئەو رەخنانەی کە پرۆدۆن ئاراستەی هیگڵی کردووە، چەند نزیکە لەو رەخنانەی کە مارکس ئاراستەی هیگڵی



کردووە، هەر چەند مارکس پرۆدۆنی بەوە تۆمەتبارکردووە کە لە "هیگڵ تێنەگەیشتووە...

لە کۆتایدا پرۆدۆن هێرشەکەی دژی دیالێکتێکەکەی هیگڵ کۆتایی پێ هێنا، لە رێگای ئەو تێبینی کردنەی کە ئایینە"کۆن و نوێیەکان" "بەرەو مانەوە نارۆن، بەڵکو بەرەو لەناوچوون دەچن" کە هەمان قسەش بەسەر فەلسەفەدا دەسەپێ" کاتێك کە ئاین ناگەڕێتەوە، دەستە فەلسەفییەکانیش ناگەڕێنەوە" "ه . س . پ ل١٢٦. پرۆدۆن لە بەرامبەر فەلسەفە میتافیزیکای دادەنا، کە رێبازولۆژێکی زانستەکانە، بەتایبەت "زانستی کۆمەڵایەتی، یا کۆمەڵناسی، و "دیالێکتێك" لە رێگای ئاشکراکردنی" فرەییە بە دوایەکدا هاتووەکان" "التعددية المتتابعات" چەقی لەسەر بەستبوو."لێرەدا سەربەخۆییەك لە نێوان هەموو رێکخراوە بەدوایەکدا هاتووە جیاوازەکان هەیە... وەکو چۆن گۆڕانێك هەیە بۆ سەرهەڵدانی زانستێکی گشتگیر ... گواستنەوەی ئەم هەمە جۆرییەی ئێستا بۆ ناسنامەیەك، واتا وازهێنان لەمەسەلەکە" وەکو چۆن شلێنگ و هیگڵ هەمان شتیان کرد.

پرۆدۆن دیالێکتێکەکەی بە شێوەیەکی چڕتر لە هەردووبەرگی "دژپێکە ئابوورییەکان" دیاریکرد"١٨٤٦" "رۆحانییەت واقع لە ناو دەبات، واقیعیش مادییەت تێك دەشکێنێ" "بەشی٢، چاپ ریفیر، ل١٠٦". "کەواتە رۆحانییەت و ماددییەت بە هەمان شێوە رەتدەکرێنەوە" "بەشی١، ل١٧٠، لێرەدا مەسەلەکە لە کۆمەڵگا دەکۆڵێتەوە" ئەو جیهانەی کە چواردەوری داوین، لەناومان بڵاوبۆتەوە، دەمانبزوێنێ، ئەوە جێیهانێکی نامۆیە....ئەوە کۆمەڵگایە....ئەوە ئێمەین" "ه. س. پ، ل٣٨٩". "بەم شێوەیە زانست بەبێ ئەوەی هیچ شتێکمان بداتێ، نە بە شێوەیەکی پێشینەیی، نە لەرێگای ئەزموون و نەلەرێگای عەقڵەوە، کە پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە هەبێ، مرۆڤ بۆ

خۆی لەزانستدا هەمووشتێکی پۆخت کردۆتەوە: چەمکەکان، دیاردەکان، گشتگیری و وتەکان و واقیع وبیروباوەڕەکان ... بەم شێوەیە مرۆڤ داهێنەری لۆژیکی ئابووری و دانەری سیستەمی ئابوورییە.

مرۆڤایەتی دوای ئەوەی عەقڵ و ئەزموونی کۆمەڵایەتی بەرهەم هێنا، هەستا بە بونیاتنانی کۆمەڵناسی "هـ . س . پ ل٣٩٠ـ٣٩١". لێرەدا دەبینین پرۆدۆن ئاماژە بە دارشتەیەك دەكا، کە دواتر جەختی دەکاتە سەر "فکر لەکارەوە سەرچاوە دەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ کار"، ئەم دارشتەیە ئەو پراگماتییە پێچەوانە بووەیە کە دواتر لە "دروستبوونی سیستەمدا" بەئاراستەی دەروا. پرۆدۆن پراگماتیك بە دیالێکتیك دەبەستێت، وەکو چۆن مارکس دواتر دیالێکتیکی بە "مومارەسەی کۆمەڵایەتی"دەبەستەوە. ئەوها پێویستە ڕێبازی دیالێکتیکی نەك تەنها بەسەر تیۆرە و بیرو باوەڕەکاندا جێ بەجێ بکرێ، بەڵکو پێویستە بەسەر ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیانەش جێ بەجێ بکرێ کە دروستی دەکا، ئەو لە بزاوتی دیالێکتیکیدا خودی خۆیەتی.

دەبینین پرۆدۆن لە چوارچێوەی ئەم واتایەدا پرۆمثیوس بەکۆمەڵگا بەراورد دەکا، کە خۆی خۆی دروست دەکا، هەروەها خۆی لە ناوەرۆکی ڕێرەوەوەی بەرهەمدا دەدۆزێتەوە. پرۆمثیوس لە سیستەمی سەرمایەداریدا چینی پرۆلیتاریایە. هەروەك هرقل کە لە ڕێگای کارو فەزیلەتەوە گەیشت بە نەمری" هـ . س . پ. ل٤٠٦". کەواتە مەسەلەکە بەتایبەتی پەیوەستە بە دیالێکتیکی کارو بەوتالآنکردنەی ئێستا و رزگارکردنی لەو تالآنکارییە لەداهاتوودا. لەلایەك مرۆڤ لەکاردا بەدیهێنەرە، لەلایەکی ترەوە کار دەگۆڕێت بۆ ڕەنجکێشانێکی بێ کۆتایی کە تالآنکراوە. دیالکتێك لە کارەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵام دەبێت بە تراژیدیایەك کاتێك لە سەرەوە "ڕێکخستنی کار" بەسەر کرێکاراندا دەسەپێنرێت، ئەم سەپاندنەش یا لە ڕێگای ویستی



موڵکدارەکانە یا لە ڕێگای بەرپرس و هاوسۆزانی دەرەبەگایەتی پیشەسازی، یا لەڕێگای دەوڵەتە سەرمایەدار و فەرمانبەرە بیروکراتییەکانییەوە بێت. ئێمە بە شێوەیەکی گشتی ناتوانین دیالێکێتکی تایبەت بەکار دروست بکەین، تەنها دەتوانین شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بەرپابکەین، کە کار لە هەموو ئەو شتانەی کە پێوەی نوساوە پاك بکاتەوە، ئەمەش لە ڕێگای فەراهەمکردنی خۆ بەڕێوەبەری کرێکاری Autogestien، کە ئەمە چەقی دیموکراسی پیشەسازییە لە کەشێکی کۆمەڵی لامەرکەزیدا.

ئەم شیکردنەوانە هەڵێکی نوێیان بۆ پرۆدۆن فەراهەم کرد، کە یارمەتیدا بۆ ئەوەی بەتوندی بەرهەڵستی هیگڵ ببێتەوە، ئەو پێی وابوو هیگڵ "لە بازنەیەکی داخراودا بەندە". هیگڵ بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵی دەدا لە پێناو دروستکردنی لۆژیکەکەیدا ئەزموونکاری بگۆڕێ، بۆیە وازی لە ئەزموونکاری هێنا بەبێ ئەوەی بزانێ کە "تیۆرە دژکارەکان سەرەڕای ئەو هێزە بێ وێنەیەی کە هەیەتی تاکە نهێنی ئاشکراکراو نییە" لەڕێگای واقیع یا لە ڕێگای عەقلەوە" هـ. س. پ، ل١٧١ـ١٧٢". هیگڵ ئەو ئەزمونکاریە مرۆییە کردەییەی کە زۆر و هەمە چەشن بوو فەرامۆش کرد بوو، وەکو چۆن ئەو فرەییەی فرامۆش کردبوو کە ڕێگای بە ئەزموونکاری دەدا ئاشکرای بکا. بەم شێوەیە دەبینین پرۆدۆن بەو ڕەخنانەی کە ئاڕاستەی هیگڵی کردبوو تەنها بە ڕەخنەگرتن لە "ئەزموونکاری دیالێکتیکی" وازی نەهێنابوو، بەڵکو ڕەخنەی لەوەش دەگرت کە پێی وابوو بزاوتە دیالێکتیکەکان حەقیقین، هەروەها لەو ئامرازە هەمە جۆرانەی کە چاودێری خوار و خێچی و چەماوەییەکانی ئەو بزاوتەش دەکەن "تەواوکاری، بە دواداچوونی هەمبەری، جەمسەرگری هاوشێوەیی دیدگاکان...". پرۆدۆن لەکتێبی "دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسا" ئاماژەی بە هەموو ئەم شتانەدابوو، بەبێ ئەوەی بگاتە کۆتایی ئەو ڕێگایە،

ئەمەش لە بەر ئەوەی کە هەرگیز نەیدەتوانی بگاتە تێپەڕاندنی ئەو کاریگەریە گەورەیەی کە بیرۆکەی دژکاریەکان لەسەری هەیبوو Autinomies، یا گەورەیی ئەو دژکاریانە ڕەتبکاتەوە.

لە کۆتایدا بۆ ئەوەی کۆتایی بەرەخنەکانی پرۆدۆن بهێنین دەربارەی ڕێبازەکەی هیگڵ، ئاماژە بە هەندێ دەقی تر دەکەین :"دژکاریەکان هەرگیز چارەسەرناکرێن" لێرەدا کەم کورییەکی سەرەکی لە فەلسەفەی هیگڵ دەردەکەوێ. ئەو دوو بڕگەیەی کە دژپێکەکەکانی پێك هێناوەAntinomie، یا لە نێوان خۆیان دەجولێنەوە یا لەگەڵ بڕگەیەکی دژپێکی تردا، کە دەبێتە هۆی بەدیهێنانی بەرەنجامی نوێ "دەربارەی دادپەروەری ... چاپی ریفیر بەشی ٤ ل١٤٨)." "برگە دژکارەکان هەرگیز چارەسەر نابن، هەروەك چۆن هەردوو جەمسەری پاتری کارەبایی یەکترتێك ناشکێنن. گرفتەکە لە پێك گەیشتنیانە نەك لە لێکدانیان کەواتای لەناوچوونیانە، بەڵکو دەگەن بە هاوسەنگییەکی جێگیری هەمیشەیی، گۆڕینیشی دەبێتە هۆی پێشکەوتنی کۆمەڵگا" (تیۆرەیی مولکایەتی، چاپی لاکردا،١٨٦٥، ل٥٢). لەراستیدا ئەو هاوسەنگییە جێگیرەی نێوان ئەو دوو بڕگەیە "هەرگیز لە ڕێگای سێیەمەوە دروست نابێ، بەڵکو لە ڕێگای بزواندنی دوو بڕگەی هەمبەر دروست دەبێ". بەکورتی"داڕشتەی هیگڵی سێ دارشتەی نییە، تەنها بەپشت بەستن بە میزاجی فێرکەر، سێ ڕەگەز دەژمێرێ لە کاتێکدا کە تەنها دوو ڕەگەز هەیە، فێرکەر نازانێ کە دژکارییەکان هەرگیز چارەسەرنابن، بەڵکو دەبنە هۆی لەرینەوە و ململانێ، لەرینەوە و ململانێش ئەو دووشتەن کە دەتوانن هاوسەنگییەکە جێگیر بکەن. لەم گۆشەنیگایەوە، پێویستە دووبارە چاو بە سیستەمەکەی هیگڵدا بەگشتی بخشێننەوە" (دەربارەی دادپەروەری. بەشی ١، چاپی ریفیر، ل٢٨ـ٢٩).



پێکهاتەی حکوومی هیگڵ، کە لەگەڵ هەندێ ئاسانکاریشدا کە بۆی سەرباركردبوو "دەستپێشخەرو بالآیە بەسەر ئەو دارشتەیەی کە کۆی دەکاتەوە" هەروەها ئەوەیە کە هیگڵی بەرەو بیرۆکەی "هێز و تواناکانی دەوڵەت" بیرۆکەی "پتەوکردن و جێگیرکردنی دەسەلآت" برد"، کتێبەکانی بیرۆکراتی یا "التعساء في الزمن الحديث" كلۆڵی سەردەمی نوێ" کتێبەکانی دواتر، چاپی لاکروا ١٨٧٥". "هیگڵ و هۆبس گەیشتن بە دەسەلآتێکی ڕەها و هێزی گشتی دەوڵەت، هەروەها گەیشتن بەوەی کە گرنگی تاك و کۆمەڵەکان ناوەندین. من نازانم کە ئەگەر هیگڵ توانیبێتی یەك لایەنگری خۆی لە ئەڵمانیا هێشتبێتەوە... بەهۆی ئەم بەشەی فەلسەفەکەیەوە. بەلآم دەتوانم بڵێم قسەکردن بەم بێ تامییە فەلسەفە ناشرین دەکات" "جەنگ و ئاشتی، ١٨٦١، چاپی ریفیر، ١٩٢٧، ل١٠٧.

پرۆدۆن دیالێکتێکە تایبەتییەکەی خۆی ڕووبەڕووی دیالێکتێکەکەی هیگڵ کردبۆوە، کە لە پێشەوەی هەموو فەلسەفە و زانستێکەوەی دادەنا. مەسەلەکە پەیوەست نییە تەنها بە دیالێکتێکی نێگەتیڤ یا دژکار کە هەموو هاوسۆزییەك ڕەتدەکاتەوە، بەڵکو پەیوەستە بەو ڕێبازەی کەکاری گەڕان بەدوای هەمە جۆرییەك بە هەموو درێژییەوە دەخاتە ئەستۆی خۆی. بەم مانایە دەبینین دیالێکتێکی پرۆدۆن لە ئەزموونکاری دیالێکتێکی Empirisme Dialectique نزیك بۆوە، گەیشت بەفرە چەشنییەك کە وردە وردە نزیك دەبۆوە لە واقیع. پرۆدۆن یەك لەدوای یەك بەڵگەی دەهێنایەوە، کە جوڵەی دیالێکتێکی یەکەم شت بزواتی واقیعی کۆمەڵایەتی خۆیەتی، هەروەها تەنها ڕێبازێکە کە ئامانجی ئەوەیە چاودێری خوار و خێچی ئەو واقیعە بکات. پرۆدۆن دەیزانی کە تەواوکارییەکان، بەدوایەکداهاتووە هەمبەرییەکان، دیدگا هاوشێوەکان، هەموویان بەئاستی حەقیقەتی جەمسەرگرییەکان حەقیقین، وای

لێ دەکا پەنا بەرێتە بەر پرۆسە دیالێکتێکییەکان کە گرینگیان لە دژکارییەکان کەمتر نییە. هەرچەند ئەزموونکاری و واقیعییەتەکەی پرۆدۆن دوودیالێکتێکن سنووریان هەیە.

سەرەرای هەموو شتێك یەكێك لە ئامانجەكانی دیالێكتێكەی "هاوسۆزییەكی گشتگیرە لەرێگای دژكارییەكی گشتگیرەوە" ئەو هاوسۆزییەی كە لە ناو هاوسەنگییەكاندا بەدوای دادەگەڕا. هەرچەند پرۆدۆن دانی بەناجێگیری دژكارییەكاندا داناوە، هەرچەند ئەو هەوڵە بەردەوامانەی كە دەیسەپاند بێ ئەنجام بوون، دژكارییەكان تەواو و هاوسەنگ دەبوون، بە شێوەیەكی زۆر ئاسان، بەو پێیەی كە لە رێگای هەڵاوسانییەوە هەموو بزاوت و پرۆسە دیالێكتێكەكانی تر بزر دەبن.

بەم شێوەیە سەرەڕای ئەوەی هەستی بە ئالۆزی زۆری دیالێکتێك، دەکرد، بەو پێیەی کە بزاوتێکی واقیعیە و هەروەها رێبازێکییشە، نیگەران بوو بەوەی کە دیالێکتێکەکەی خۆی بکات بە فرە چەشنییەکی رێك و پێك و تەواو و هاوسەنگە و دەرئەنجامی رێکخستێکی رێك و پێکی بابەتی پێشووە.

لێرەدا هەست بەو خزانە عەقڵییە دەکەین کە فکری پرۆدۆنی تێکەوتووە، ئەم خزانە لە کارە سەرەتاییەکانی هەستی پێ دەکرێ، کە هەرگیز نەیتوانی خۆی لێیان دەرباز بکات. بۆ نموونە پرۆدۆن لە کتێبی "پیرۆزکردنی رۆژی یەکشەم" (چاپی ریفیر، ل٨٩) دەڵێ: "لێرەدا زانستێکی بەهێز بۆ کۆمەڵگا هەیە، پێویست ناکات دایبهێنین، بەڵکو پێویستە بیدۆزینەوە"، چونکە "لەسەر عەقڵی گشتگیر چەقبەستووە"، دوای ئەو دەڵێ" یەکسانی مەرجەکانی مەسەلەکە لەگەڵ عەقڵدا رێکەوتووە" "ه. س. پ، ل٩٥". هەروەها پرۆدۆن لە "یادەوەری یەکەمدا" بە شێوەیەکی بەردەوام پەنا دەباتە بەر عەقڵ بۆ



ئەوەی بیسەلمێنێ کە مولکایەتی و نایەکسانی هەرگیز پێك ناگەن. عەقڵی گشتگیر لە ماوەی دادپەروەریدا دەردەکەوێ." ئێوە لێرە هیچ نابینن تەنها زنجیرەیەك تاقیکردنەوە نەبێ دەربارەی یاسا و دادپەروەری " "ه. س.پ، ل١٣٤). لەراستیدا پرۆدۆن سەرەڕای ئەوەی "بەرێکەوتنی نەرموونیانی"، وساکاری بیروباوەر تۆمەتبار دەکرا، دەنووسێ دادپەروەری هەسارەیەکی سەنتەرییە کە سەرپەرشتی کۆمەڵگاکان دەکا... بەو پێیەی کە هیچ شتێك بە نێوان مرۆڤەکان دا ناڕوا مەگەر بە پەیوەستبوونی بە یاساوە نەبێ، و هیچ شتێك ناشێ رووبدا بەبێ ئەوەی دادپەروەریمان بەیاد نەهێنێتەوە" ه . س . پ ". کەواتە س. بوگلیە بەهەڵەدا نەچووە کە دەڵێ :"پرۆدۆن بەوەندە واز دەهێنێ کە تێبینی ئەوە بکەین کە عەقڵ و هۆشیاری چۆن لە ئەنجامی مولکایەتییەوە بێ هێزبوون. ئەو بەهێزی لۆژیك وا دەردەخا کە پێشی هەموو ئەو نەیارانەی کەوتووە کە بەبنەما تایبەتییەکانیانەوە کۆت و بەندبوون" "سۆسیۆلۆژیا پرۆدۆن، ١٩١١، ل١٥٥) هەروەها لە قسەکردن دەربارەی "ئەفلاتوونییەتی پرۆدۆن فیساگۆرسی" بەهەڵەدا چووە (ه. س. پ، ل٢٥ـ٢٧).

چیرۆکی ئەفلاتوونییەتی پرۆدۆن، کەبەم دوایە "بەیار هوبتمان "١٩٦١" لەسەر نووسینی دەربارەی "فەلسەفەی کۆمەڵایەتی لەلای پرۆدۆن" بنچینەکەی دەگەرێتەوە بۆ کتێبی "کلۆڵی فەلسەفە" کە مارکس لە ١٨٤٧ نووسیویەتی. لەو کتێبەدا مارکس پرۆدۆنی بەوە تۆمەتبارکردووە کە بەچاوی گرنگییەوە لە واقیعی نەڕوانیوە" وتە ئابوورییەکان تەنها گوزارشتێکی تیۆری نین دەربارەی پەیوەندییە کۆمەڵاتییەکان و پاککردنەوەی ئەو پەیوەندیانە. پرۆدۆن، بەو پێیەی کە فەیلەسووفێکی حەقیقییە مەسەلەکانی بە هەڵگەراوەیی گرتووە، لەو پەیوەندییە حەقیقیانەش هیچ نابینێ، تەنها چاو تێبڕینی ئەو بنەماو وتانە

نەبێ کە لە باوەشی عەقڵی ناکەسایەتی مرۆڤدا ماونەتەوە "...." ئەو مەسەلەیەی  کە پرۆدۆن لێی تێنەگەییوە" ئەوەیە کە "هەمان ئەو مرۆڤەی کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەرێکی لەگەڵ بەروبوومە مادییەکانی جێگیر دەکات، هەر ئەوانن کە بنەماو وتەو بیروباوەڕەکان بەرێکی لەگەڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەرهەم دێنن. بەم شێوەیە دەزانین کە بیروباوەڕ و ووتەکان کەمتر نەمرن هەتا لەو پەیوەندیانەی کە لێوەشی دێن ئەمانەش تەنها چەند بەرهەمێکی مێژوویی و گواستنەوەکین"چاپخانەی کۆمەڵایەتی، پاریس،١٩٤٥، ل٨٨".

لەو تێبینیانەی کە لە پەراوێزی کتێبەکەیدا نووسیویەتی دەربارەی "کلۆڵی فەلسەفە"ەکەی مارکس، پرۆدۆن بە توونـدنی نارەزایی دژی ئەو "شێواندنە هزرییە"ی دەربڕیوە، دەڵێ:" ئەوانە هەمووی درۆن، کۆمەڵگا یاسا و کەلوپەلەکان بە ئەزموونی تایبەتی خۆی بەرهەم دێنێ ... هەرگیز بینیوتانە شتی وا بلێم، بنەماکان شتێکی ترن نەك راڤەی زهنی، هۆکاری لە دایکبوونی ئەو واقیعانەش نین؟" (چاپی ریفیر "دژکارییەکان" بەشی٢، تێبینییەکان ل٤١٦ـ٤١٨). تورەبوونی پرۆدۆن زیادی کردو بوو بە یەکێك لەوانەی کە بەتووندی هێرشیان کردە سەر ئەفلاتوون، هەروەك پێشتر هێرشی کردبووە سەر میسالییەکان نموونەیەکان" کەلە کتێبی "داهێنانی سیستەمدا" بە نەخۆشی وشکی بیروباوەڕ "ئایدیومانیس" وەسفی کردبوون، ئەم کتێبە ئەوەیە کە پرۆدۆن تێیدا هەوڵیداوە، وتەزاکان و بنەماکان و تیۆرەکان، لە گشتێکی کۆمەڵایەتیدا لێك بدات، بەو پێیەی بەرووبوومی ئەو چین و دەستە وکۆمەڵگایانەن، کە تیۆرەکانی هەوڵی بەڵگە هێنانەوەی دەدەن.

لەراستیدا مارکس وەك بوگلییە و بەیار هۆبتمان، بڕیارە هەڵەکانی خۆی لەرێگای تێکەڵکردنی عەقڵانییەت و میسالییەت لەلایەك، و ڕۆحانییەت و



عەقڵانییەت لە لایەکی ترەوە، پوختکردەوە. هەرچەند ئەم عەقلانییەتە بەرێگای هەریەك لە دیکارت و سپینوزا وکانت، دەتوانین لە ئاراستەی رۆحانی "کانتی" و ئاراستەی میسالییەتی (دیکارت و سپینوزا)ی، جیابکەینەوە.

عەقلانییەتی پرۆدۆن وەکو لە کتێبە سەرەتاییەکانی دیارە عەقڵانییەتییەکی دیکارتی و کانتی رەسەنە. بەڵام ئەو هۆکارەی کە تووشی هەڵەی کرد، چەمکی "ئایدیۆ ـ واقیعی" لێڵ یا "میسالی ـ واقیعی" کە پرۆدۆن لە کراوس و ئاهرنری وەرگرتبوو، لە چوارچێوەیەکی جیاوازدا بەکاری هێنا بوو. دەڵێ بیروباوەڕەکان ـ لە هەمان کاتدا پرۆدۆن بەرهەمهێن و بەرهەمی واقیعی کۆمەڵایەتین، هاوبەشی کردن لە گشتگیری دینامیکی بۆ هەوڵی کۆمەڵی، دەبینین سان ـ سیمون و مارکسی گەنج هەمان شتیان وتووە.

بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ عەقلانییەتی پرۆدۆن، دەبینین کە ئەگەر لە "یادەوەری یەکەمدا" قسەی دەربارەی "سەروەری عەقڵ" (ل٣٨٩)، و پابەندی یاسا و دادپەروەری بە عەقڵ کردبێ، کەواتە ئەو لە سەرەتاوە بەسنووری عەقڵ هۆشیار بووە. لە هەمان کتێب، دەڵێ :"زانستی کۆمەڵگا... بە هیچ حالێك هیچی نەکردووە، ئەمەش بە هۆی قولّی و فرەچەشنی بابەتەکان بووە,کە چارەسەرەیان، ناکۆتاییە" ل٣١٧". دوای ئەو لە "دژێکە ئابوورییەکان"، بەشی٢، دەڵێ ئەم زانستە ئەو زانستەیەکە" خۆی لە چوارچێوەی واقیعەکەیدا دروست دەکات" ل٣٨٩. لێرەدا دەبینین کتێبە سەرەتاییەکانی پرۆدۆن رێگامان بۆ خۆش دەکات لە نێوان بیرباوەڕەکانیدا، تامی پراگماتیکی بدۆزینەوە، هەروەها دژایەتییەکی توندو هەست پێکراو بۆ هەموو شێوەکانی خۆرسکی "فطریە"و هەموو جۆرەکانی پێشنەیی بدۆزینەوە. لێرەدا دەتوانین نارەزایی دەربڕین کە باوەڕی پرۆدۆن بە دادپەروەری و سەروەری یاسا، سەرلە نوێ دەگەڕێتەوە سەر خزینە عەقلانییەکەی، هەرچەند  بەڵگە هێنانەوە بۆ ئەم

نارەزاییە ئاسان نییە، تەنها بۆ هەندێ لە دارشتەکان نەبێ، بەڵام بۆ بیروباوەرە سەرەکییەکانی راست نییە. لەراستیدا پرۆدۆن دوو روخساری جیاوازی بۆ دادپەروەری دیاری کردووە ئەویش "بابەتی و خودەکیە"، بابەتی تەنها هاوسەنگییەکی ناجێگیری هێزی کۆمەڵایەتییە کە لە ناو دیالێکتێکی بزاوتدا دەگاتە بەرزی خۆی، کاتێك کە لەگەڵ روخساری خودەکیدا دەچنە ناویەك، هەروەك چۆن یاسا "ماف" هەمیشە رێژەییە و بە جیاوازی کۆمەڵگا و پێکهاتەکەی دەگۆرێ.

کەواتە بیری پرۆدۆن و پرۆدۆن گەیشتە لوتکەی کاملبوون پراگماتی دیالێکتێکی و واقیعی ئەزموونگرایی بەشێوەیەکی فراوان دەرکەوت، ئەو ئاراستە عەقلانییە لە کویێوە هات، کە بووە هۆی جێگیرکردنێکی هاوشێوە لە نێوان "هۆشیاری کۆمەڵی" و "عەقڵی کۆمەڵی" پێش خستنیش"الافضلیة" بۆ عەقڵی کۆمەڵییە، لە پرۆسەی نارێکی واقیعی کۆمەڵایەتیدا، مەسەلەی پێش خستنی دادپەروەری بەسەر نموونەی باڵا" دا لەسەر ویژدان چەقبەستووە، هەروەها گەران بەدوای هاوسەنگیدا جێگیر و رێکوپێکە؟ ئەم پرسیارە زۆر بە جەختکردنەوە لە خۆی کرد، پرۆدۆن کە زۆر جەختی لەسەر هەوڵی کۆمەڵی "خۆبە خش و ئازاد" دەکرد، ئەو هەوڵەی کە دەبێتە بنەمای مومارەسەی شۆرشی داهێنەر، کە بە رەتکردنەوەی چەمکی پێشکەوتن کۆتایی دێ، بە واتایەکی تر دەگاتە ئاستێك کە ئەو چەمکەی سەرکەوتنیشی هەرەسهێنانییەتی، جێگای شۆرشی داهێنەر دەگرێتەوە. دەتوانین وەڵامی ئەمە بەسێ تێبینی وەڵام بدەینەوە: یەکەم، عەقلانییەتی پرۆدۆن تەنها کاردانەوەیەکی توندە دژی ئەو سۆفیگەراییەی "التصوف" کە لە لای زۆربەی فەیلەسووفە کۆمەڵایەتییەکانی فەرەنسی برەوی هەبوو، مەسەلە کە چ پەیوەست بێ بەسان ـ سیمون یا بە کلێسای سان ـ سیمونییەوە، یا بە



"گوریە" یا "لێرو" یا "بوشیە" یا ئوگست کونت" کە زهنییەتی کلتووری گۆری بۆ زهنییەتی کۆمەڵایەتی بەکارهێنراو، بۆ "کەهوتیە" کە دەربارەی مرۆڤێکی گەورەی بونیاتنراو لەسەر خۆشەویستی، قسە دەکا، مەسەلەکە چ پەیوەست بێ بەمانە یا یەکێکی تر، لە چوارچێوەخستنی ویژدان لە کۆتایدا شێوەیەکی سۆفیگەری کۆمەڵایەتی فرەئاراستە بە خۆوە دەبینێ. ئاشکرایە پرۆدۆن دەرکی بەو رێگا داخراوە کردبوو کە بەرەو ئەو ئاراستەیەی دەبرد، هەروەها وای هەست دەکرد کە دیالێکتێکی هیگڵی لە سۆفیگەرییەك بۆ چەمکی رەوشت، زیاتر نییە. ئەگەر کاردانەوەکەی رەنگێکی عەقلانی وەربگرێ بۆ دارشتنەکەی، کەواتە ئەم دارشتنەیە بە شێوەیەکی سەرەکی فکری تێدەپەرێنی، بەرەو پراگماتی و واقیعی دەروا.

کاردانەوەکەی پرۆدۆن توند تر بوو و زیادەرەویەکی زۆری تێدا کرد، تاوای لێهات کاردانەوەکە لە زۆربەی فەیلەسووفە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆی، رەتکرایەوە، بەدانپیانەنان بەو رۆڵەی کە رێکخستنی یاسایی لە ئالۆزکاوی واقیعی کۆمەڵایەتیدا، دەیگێرێ. بەڵام رق لێبوونەوە لە هەموو ئەو دڵنیایانەی کە لە رێگای یاساوە دێن لەلای ئوگست کونت گەیشتە ئەوپەری و بەهەموو شێوەیەك یاسای رەتدەکردەوە، وەکو چۆن یاسای هۆکارەکیشی رەت دەکردەوە، بەوپێیەی کە دوو چەمکن لە قۆناغی میتافیزیکیاوە سەرچاوەیان گرتووە. بەڵام لەلای پرۆدۆن، پەنابردنە بەر دادپەروەری و یاسا پەیوەستە بە گەران بە دوای هاوسەنگییەکاندا. ئەوە سەرەرای ئەوەی دانی بەرێژەیی و خاویان دادەنا، کەچی پتەوبوونیان سوودی نەبوو. بەڵام هەمیشە جەختی لەسەر فرە رێکخستن و رێژەیی یاساکان دەکرد، بەرامبەر رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکانی تر.

لە کۆتایدا دەبینین گشتگیری و سەروەری عەقڵ لەلای پرۆدۆن، وردە وردە لەگەڵ رێبازی دیالێکتێکی هاوشێوە دەبوون. وەکو چۆن "ژان پۆل سارتەر"

لەسەرەتادا بەمەسەلەی "عەقڵی دیالێکتێکی" سەرقاڵ بوو. بەڵام بە گوێرەی پێویست زهنی خۆی بە"دیالێکتێك عەقڵ" و ئەو پەیوەندییە دیالێکتێکییەی کە لە نێوان عەقڵ و واقیعدا جێگرە، سەرقاڵ نەکرد. کە بووە هۆی ئەوەی گرینگییەکی زۆر بە ڕێبازی دیالێکتێکی بدا، بەڵام بەبێ گرنگیدان بە بزاوتی دیالێکتێکی حەقیقی کە بۆ واقیع دەگەڕێتەوە بۆ ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییە بە شێوەیەکی تایبەت. بەڵام هەرچەند پرۆدۆن زیاتر لە شیکردنەوەکانیدا قوڵ بوایەتەوە، زیاتر لە ڕێگای جەختکردنە سەر پراگماتیکی، ئەو ئاراستەیەی دیاری دەکرد. بەم شێوەیە گەیشتە بیرۆکەی سەرپەرشتی دیالێکتێکی تایبەت "مومارەسەی شۆڕش"، بەسەر دیالێکتێك کە ڕێبازە، هەروەها بەم شێوەیە دیالێکتێکی عەقڵی" وردە وردە گۆڕا بە دیالێکتێکی ئەزموونی، لێرەدا "عەقڵی دیالێکتێکی" پەنادەباتە بەرهەڵاوسانی دژکارییەکان.

ئاراستەی پراگماتیکی بۆ فەلسەفەی کۆمەڵایەتی پرۆدۆن، لە شەشەم لێکۆڵینەوەی کتێبی "دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسا" زیاتر ڕوون و ئاشکرایە، کە لێکۆلینەوەکە تایبەتە بە "کار". لەم لێکۆڵینەوەیەدا پرۆدۆن دەڵێ "کار بنەمای هەموو ئەو شتە مرۆییانەی کۆمەڵگاو مرۆڤە". بەهۆی کارەوە "ئازادی مرۆڤ توانی کۆنترۆڵی ناچارەکی سروشت بکا" ل١٧. لە ڕێگای کارەوە مرۆڤ توانی ببێ بە سەروەری دروستکراوان. هەرچەند کار لەیەك کاتدا دەستەجەمعی و تاکەکەسیشە، بەڵام زیاتر لەوەی تەنها هێزێکی دەستەجەمعی بێت. کار هەوڵ و بزاوت و بەرهەم هێنی گشتیش چ بۆ هێزی کۆمەڵبێ یا بۆ زهن و بیروباوەڕ و بەهاکانی بێ. بەکورتی کار پێك گەیشتنی هەموو ئەو ڕەگەزانە بەرجەستە دەکات. کار تەنها هێز و بەها ئابوورییەکان بەرهەم ناهێنێ، بەڵکو مرۆڤ و کۆمەڵ و کۆمەڵگاکان و بیروباوەڕەکان بە بیروباوەڕی دادپەروەریشەوە، بەرهەم دێنێ. لە ئەنجامدا دەبینین "کۆمەڵگای جوڵاو" لە گشتێتی خۆیدا، خۆی لەڕێگای کارەوە بەرهەم دێنێ. بیر، بە هەموو وتەکانییەوە، لە کارەوە سەرچاوە دەگرێ و پێویستە بگەڕێتەوە بۆ کار" "ئەمەش واتا هەموو زانیارییە پێشینەیەکان Apriori و بە میتافیزیکاش، لە کارەوە سەرچاوە دەگرێ، بۆیە پێویستە خزمەت بە ئامرازەکانی کار بکات، بە پێچەوانەی ئەوەی کە گەورە فەیلەسووف و ڕوحانییە ئاینییەکان، بانگەشەیان بۆ دەکرد، کە پێیان وابوو فکرە ئاشکرا کردنێکی خۆڕاییە، کە بە شێوەیەکی غەیبی نادیارەوە بۆمان دێ، پیشەسازیش تەنها جێبەجێکردنیەتی "ھ . س . پ ل٦٩".

ئەگەر بیر" الفكر" بەتایبەت بیرۆکە" الفكرة" لە کارەوە سەرچاوەی بگرێ، نەك کار لە بیرەوە، کەواتە پێویستە کار بەسەر تیۆڕوانینەکاندا لاسەنگ بکرێ، وەکو چۆن پێویستە کرێکارێك بەسەر فەیلەسوفێکدا پێش بخرێ، واتا سەرەو ژێرکردنی بیروباوەڕەکانی پێشوو هەروەها سەرەو ژێرکردنی بارودۆخی ئێستای کۆمەڵگا "ھ . س . پ ل٧١. " لە ناو ئەم مەرجانەدا چالاکی دەردەکەوێ بە وپێیەی کە یەکەم هۆکارە کە کاریگەری لە بیروباوەڕەکان دەکا، وەکو چۆن کاری یەکەم لە سەرەتادا هۆشیاری مرۆیی ڕووناك دەکردەوە" ھ . س . پ ل٧٢". مرۆڤ لە ڕێگای چالاکیە هەرەمەکیەکانیەوە خۆی ئاماژە بۆ خۆی دەکات، بیری کاریگەری لە زهنی دەکا و دەبێت بە کارێکی تایبەت، واتە مرۆڤ ڕۆلێکی دوولایەن دەگێرێ، ئەو لەلایەك لەڕێگای واقیع و هەڵس و کەوتەکانییەوە، کە گوزارشت کردنە لە بیرو باوەڕەکانی، "سەروەرە" بەڵام لە ڕێگای ملکەچی بۆ کارەکانی "پاشبەندە" تابع"، هەروەها دەبێ مرۆڤ هەوڵی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ئەو ئامرازە دەرەکیانە بدات کەلە چوارچێوەی جوڵەکانیدا هێماو ئاماژەکانی دەدۆزینەوە. لەڕاستیدا ئەمانە هەمووی سەرو ژێر بوونەتەوە، فەلسەفەی ڕوحانییەت دەمانبا بەرەو ئەوەی کە کرێکار

دامەزرێنەری شارستانییەتە، داهێنەر و سەروەری بیرە، سەروەرێکی رەهای فەلسەفەشە" هـ. س. پ، ل٧٣".

لێرەدا لە کۆمەڵگا "شتێك بۆ هەموو ئەو هێمایانەی لە دێرزەمانەوە، وەکو هۆکار و ئامرازێکی زانیاری بەکارهاتوون، شتێك کە ئەو هێمایانە لاساییکەرەوەبن، ئەگەر کۆپیەکەی نەبن "هـ . س . پ ل٧٣." ئەو شتانەش بزوێنەرانی پیشەسازیین ... یەکەم شتە لە نێوان هەموو ئامرازەکانی کاری مرۆیی ... گرینگترین و گشتگیرترینیان نوێل "العتلە" و بزوێنەرە"مرتاج" هـ. س. پ، ل٧٤ــ٧٥". بەم شێوەیە دەبینین پراگماتی لە هەندێ چەمینەوەکانیدا، لەلای پرۆدۆن ئامرازەکیە Instrumentalism ، لەلای فەیلەسووفی ئەمریکی " دیوی" Dewy هەمان شتە". "لە چوارچێوەی ئەم پەیوەندیەدا، دەتوانین بلێین، کە زیرەکی کرێکار تەنها لەسەریدا نییە، بەڵکو لە دەستەکانیشیدایە" هـ . س . پ .ل٩٦ـ٥٧.

لەم کاتەدا دەبینین هاتنی مەکینە لەم بوارەدا هەندێ گرفتی دروستکرد "دوای ئەوەی ئامێرە وردەکان بەتەواوی جێگای شارەزایی دەستەکانیان گرتەوە، رۆڵەکانی نێوان مرۆڤ و مادده گۆڕان: زهنییەت نەگەڕایەوە بۆ کرێکار، بەڵکو لە ئامێرەکاندا بەرجەستە دەبوون، ئەو شتەی کە لە رابردوودا لەلای کرێکار چاوەڕوان دەکرا، ئێستا سەبارەت بە کرێکار بۆتە جۆرێك لە گەندەڵی عەقڵی"(هـ . س . پ ل٩١). کار و بیر ناگەڕێتەوە وە بۆ کار تەنها ئەگەر ئەو هێزە کۆمەڵێییەی کە بۆ بەرژەوەندی هەندێ موڵکدار تالآنکراوە، نەگەڕێنرێتەوە"، هەروەها تەنها ئەگەر کار لە رێگای دیالێکتێکەوە لە تالآنکاری پاك نەکرێتەوە، ئەوەش بەچەسپاندنی قۆناغەکانی پێشوو، کە یەکەمیان چەسپاندی دادپەروەری کۆمەڵایەتییە بەسەرکاردا و ئەوەی تریش شۆڕشی کۆمەڵایەتییە".



"بەم شێوەیە بەشی یەکەمی قسەکانمان جێگیربوون: بیر لەگەڵ گشت وتەزاکانی لە کارەوە لە دایك دەبن: یا بە چەند وشەیەکی تر پیشەسازی دایکی فەلسەفەو زانستەکانە. ماوە بەڵگە بۆ بەشی دووەمی قسەکانمان بهێنییەوە: پێویستە بیر بۆ کار بگەڕێتەوە، واتا پێویستە فەلسەفە و زانستەکان بگەڕێنەوە بۆ پیشەسازی، ئەگەر نا مرۆڤایەتی دەڕوخێ و لە ناودەچێ "هـ . س . پ.ل٨١".

بەم شێوەیە داماڵینی تالآنکاری لە پرۆلیتاریا و بە هۆیەوە لە کۆمەڵگا، تاکە شتێکە کە دەتوانێ بیروباوەڕ و زانیارییەکان کارا "فعال" بکات . لێرەدا دەبینین بیری پرۆدۆن لەگەڵ بیری مارکس پێك دەگەن بەتایبەت لەو شتانەی لە مارکس لە کتێبی "تێزە زانستییەکان دەربارەی فیوێرباخ" وتویەتی.

بەڵام پراگماتی واقیعی لای پرۆدۆن زیاد جەختی لەسەرکراوە، ئەوەش لە رێگای ئەو گفتوگۆیەی کە لە لێکۆڵینەوەی حەوتەمی کتێبی "دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسادا" گرتۆتە خۆی "بەشی ٣، ل٤٨١ـ٦٤٨". ئەم لێکۆڵینەوەیەکە ناوی "پێشکەوتن و داروخانە" باس لە گرتنی پێشکەوتنی گوماناوی دەکا. پرۆدۆن لێرەدا بەهێرشکردنی بە تەنها بۆ سەر ئەو پێشکەوتنە واز ناهێنی کە لەگەڵ پێشکەوتنی ناچارەکی و پێویستی و بزاوتی لە خۆوە تێکەڵ کراوە، بەڵکو هێرش دەکاتە سەر ئەو بیرەی کە دەڵێ دەکرێ پێشکەوتن بە حەتمییەتی زانستی کۆمەڵایەتیوە پەیوەست بکرێ. "داروخان و داکەوتن" وەکو پێشکەوتن حەقیقین " ل٥٣٧. پێشکەوتن سەبارەت بە پرۆدۆن "ماوەی ئازادیە"مسیرة الحریة" کە بە تەنیا دەتوانی بمانگەێنێ بە لوتکەی چاکسازی، بەمەرجێك بزووتنەوەیەکی پەلەی لەگەڵ بێ، کە لەسەر شێوەی شۆڕشەکان دەربکەوێ. "ل٤٥٠"، لەگەڵ ئەوەی کە سەرکەوتن هەمیشە ناوەڕۆك نییە. بەڵام هەر چەمکێکی تر بۆ پێشکەوتن دژکارو نەگونجاوە. من دانی پیادەنێم کە لە

رابردوودا بەم هەرا فیزیولۆجی سیاسییە هەڵخەڵەتابووم، کە زۆر بەرامبەر تاقیکردنەوەکان خۆراگر نەبوو" ل٤٩٥".

لەگەڵ ئەوەی کە پێشکەوتن بەو ڕێگای کە ئێستا دیاریمانکردووە" نەك تەنها شایەتی ئازادیمان نەبووە" بەڵکو بەڵگەی" کویلایەتیمان" بووە، لەگەڵ ئەوەی "کە مەسەلەکە پەیوەستە بە زانیارییەوە ئەگەر پێشکەوتن وەهم نەبێت" ل٥٠٩". ئەگەر ئەم پێشکەوتنە بخەینە سەر کارە ئازاد و داهێنەرەکان کە لە شۆڕشەکاندا گۆزارشتی لێدەکرێ. لەڕاستیدا شۆڕشەکان سوودیان لەو درزە وەرگرت کە کەوتە نێوان حەتمیاتە کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی بکا. دەتوانین بڵێین ئەگەر "پرگسۆن" وای ببینێ، کە ئەوەی تایبەتە بە ژیانی بایۆلۆژی روتەوە، بیرۆکەی پەرەسەندنە"التطور" کە لەلایەن بیرۆکەی پەرەسەندنی داهێنەرانەوە تێپەڕێنراوە، کەواتە پرۆدۆن وای دەبینی، ئەوەی تایبەتە بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە بیرۆکەی پێشکەوتنە "التقدم" کە لەلایەن بیرۆکەی پەنابردنە بەر شۆڕشێکی بەردەوام نوێبۆوە تێپەڕێندراوە، کە لە ناوەڕۆکی خۆیدا هەمیشە سەرکەوتنێکی بەردەوام نەبووە.

لێرەدا دەبینین پرۆدۆن بە شێوەیەك بە سەردەمەکەیەوە پابەند بووە کە نەیتوانیووە بەرئەنجامی کۆی شیکردنەوەکانی خۆی لێ پاك بکاتەوە. پرۆدۆن بیرۆکەی پێشکەوتنی بەئاراستە پراگماتیەکانی خۆیەوە پابەندکردبوو. بۆیە دەنووسێ و دەڵێ:" پێشکەوتن بریتییە لە پاکانەی" تبریر" مرۆڤایەتی بۆ خۆی، بەدوور خستنەوەی نموونەی بالاَ "هـ . س . پ ل٥١١. بەڵام ئەگەر پێشکەوتن تەنها نەبێتە پاکانەی مرۆڤایەتی بۆ خۆی ئەوا نابێتە جۆرێکیش لە ئایدیۆلۆژیا، ئەگەر نەڵێین ئەفسانە سروش بەکار دەدا بەهەمان شێوەی کە"سورێل" بەهۆیەوە لە مانگرتنی گشتی تێگەیشتووە، لە واقیعدا ئەم تیۆرەیە بووە پشتگیرییەك بۆی کاتێك باسی لە پێشکەوتن کردووە کە "بلاو



بوونەوەی هۆشیارییە". لێرەدا دەتوانین پرسیارێك بخەینە روو، بۆچی بیرۆکەی پێشکەوتن، کە لە کارەوە سەرچاوەی گرتووە ناگەڕێتەوە بۆ کار "لەسەر شێوەی یاسایی یا رەنگ رێژکراو؟ لەم بوارەدا پرۆدۆن دەڵێ: "بەبێ ئەوەی گرینگی زۆر بە پەرەسەندن و سروشت و مێژوو بدرێ، دەڵێت پێشکەوتن پێش هەر شتێکی تر بریتییە لە دیاردەیەك لە دیاردەکانی سیستەمی رەوشتی، کە بزاوتەکەی زۆر بەپەلە بلاو دەبێتەوە" ل٥١٢. هەرچەندە کە سیستەمی رەوشتی بەکاروکاری کۆمەڵێیەوە پەیوەستە، لێرەدا پێشکەوتن جارێکی تر لەسەر شێوەی بیرۆکەی پراگماتیی پێشکەش دەکات، کە بە توانا لە سروش وەرگرتن لە بەرزترین ئاستی هەوڵ و ئازادی و کارو کاری شۆڕشی.

بە شێوەیەکی کۆتایی، پێشکەوتن لای پرۆدۆن، هەندێ جار لەسەر شێوەی تیۆرەیەکی تایبەت پێشکەش دەکرێ کە ئامانجی هاندانی کاری کۆمەڵێیە، هەندێ جاریش لەسەر شێوەی سەرکەوتنی ئازادی مرۆیی بەسەر حەتمیاتە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆی نیشان دەدات، بەڵام هەندێ جار لەسەر شێوەی گوزارشت لە واقیع بە هێزی شۆڕشە سەرکەوتوو و لە بارچووەکانەوە خۆی پێشکەش دەکا "مرۆڤایەتی خۆی چاکی دەکا و خراپیشە بۆی" ئەم سێ لایەنە لە رێگای بنەچە هاوبەشەکانییەوە خۆی دەبینێتەوە کە چوونەتە ناویەك. هێزی کۆمەڵی لە رێگای دیالێکتێکی ئالۆزی تایبەت بە واقیعی کۆمەڵایەتییەوە دەگاتە ئاستی نموونەی خۆی، ئەو دیالێکتێکەی کە لە نێوان هەموو پلە جیاوازەکانی کۆمەڵگای بزاوتەکی "المتحرك" بەدوایەکدا چوونێکی هەمبەری دەخاتەڕوو. لە بنەمادا دەبینین پرۆدۆن بیرۆکەی پێشکەوتنی هەمەکی تێپەڕاندووە، بەبێ ئەوەی بزانێ کە یەکجارەکی لێی پاك بۆتەوە. ئەو تەنها لە پێناو پاراستنی وزەی شۆڕشی چینی کرێکار لای مابۆوە. ئەو دەقانەی کە لەسەرەوە شیمان کردەوە قۆناغێکی بالاَمان پێشکەش دەکات کە لەناو

چوارچێوەی کۆمەڵناسی هاوچەرخدا دەبێتە هۆی واز هێنان لەو تێگەیشتنەی "مفهوم" کە ملکەچی گفتوگۆیە. ئێستا ئەوەی دواییان لە چوارچێوەی سۆسیۆلۆژیای مەعریفەدا دەچێتە ناو سۆسیۆلۆژیای ئەفسانەکان "کە سۆسیۆلۆژیای بیرۆکەی پەرەسەندنی پێ دەبەستریتەوە"، لە هەمان کاتدا هەموو ئەو دەرخستنانەی کە دەیبا بەرەو پێشبینی کردنی دوا رۆژ بۆ مەودایەکی درێژ، لە هەمانکاتدا لە هەموو تێکەڵکردنێکی نێوان بزاوتی کۆمەڵایەتی حەقیقی و چاکبوونێکی دڵنیا رزگاری دەکا.

## ٢ـ سۆسیۆلۆژیای پرۆدۆن:

پرۆدۆن بە کۆمەڵناسی دەوت، زانستی کۆمەڵایەتی. ئەو لە کتێبە سەرەتاییەکانیدا هەستی بە ناوەڕۆکی کۆمەڵناسی کردبوو، کە دواتر لە کتێبی "دژکارە ئابوورییەکان" پەرەی پێدا، لە کتێبی "دادپەروەری لە شۆڕش و کلێساشدا" وێنەیەکی شیکاری وردتری خستەروو. " چاپی ڕێفیر بەشی ٢، لێکۆڵینەوەی ٤، دەوڵەت، بەشی٣، دیراسەی حەوتەم، بیروباوەڕەکان".

لە یادەوەرییەکانیدا دەربارەی موڵکایەتی، پرۆدۆن بانگەشەی چەمکێکی سەرەکی کۆمەڵناسییەکەی دەکرد، ئەویش چەمکی "هێزی کۆمەڵی" یەکە ناتوانرێ لە "هێزی تاکی" جیا بکەینەوە، هێزی کۆمەڵی تایبەتە بە کۆمەڵ و چین و کۆمەڵگاکان، کە بەروبوومیان لە کۆی هێزی تاك زیاترە. بەشێوەیەکی تایبەت دەتوانین بڵێین هێزی کۆمەڵایەتی کارو بەها ئابوورییەکان بەرهەم دێنێ. راستە سەرمایەدارەکان تا ئاستێك نرخی هێزی تاکی هەموو کرێکارێك دەدات، بەڵام نرخی ئەو "هێزە گەورەیە" نادات کە لە ئەنجامی یەکگرتن و یەکێتی و هاوسەنگی هەوڵی کرێکارەکان و "هێزی کۆمەڵیانەوە" دەردەچێ ".



لێرەدا ئیستغلال کردنی کرێکار دەست پێ دەکات. ئاشکرایە ئەم تیۆرەیە لە پێش تیۆرەی "زێدە- بەها" دێت کە مارکس دوای ٢٧ ساڵ لە کتێبی "سەرمایە" دا، چاکسازی تێدا کرد لەگەڵ ئەوەشدا پرۆدۆن لەرێگای وەرگرتنی چەمکی" کۆمەڵایەتی Sociabihte " یەوە جیاوازی لە نێوان پلەی کۆمەڵایەتی دەکرد، کۆمەڵایەتی هەرەمەکی "کە بریتییە لە کۆمەڵایەتییەکی سۆزدار"، کۆمەڵایەتی دادپەروەری، کۆمەڵایەتی یەکسان لە بارودۆخەکان، کە پێشتر هەرگیز بەدی نەهاتووە.

لە کتێبی "سەرهەڵدانی سیستەمی مرۆڤایەتی" پرۆدۆن هێزی کۆمەڵی دەبەستێتەوە بە چاکسازی ئامرازەکان و مەسەلەی رێکخستنی کار، کە بزوێنەری سەرەکی بوون بۆی. "کرێکاری کۆمەڵی تەوەری بزاوتی کۆمەڵایەتییە" و "کار هێزێکی پێکهێنەرە لە کۆمەڵگا... یا کار هەموو قۆناغەکانی گەشەی کۆمەڵگا دیاری دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا رێکخەری کۆمەڵگایە چ دەرەکی بێ یا ناوەکی." بنکەی بزاوتی کۆمەڵایەتی، ژیانی ئابوورییە"، بەڵام لێرەدا دەبینین س. بوگلییە، کەوتۆتە هەڵەوە کاتێك لە کتێبەکەیدا دەربارەی پرۆدۆن دەڵێ، "پرۆدۆن لە کتێبەکانیدا وێنەی جۆرێك لە ماتەریالیزمی مێژووی پێش مارکس، کردووە" سۆسۆلۆژیای پرۆدۆن، ١٩١١، ل١٠٨ـ١١٣. لەلای پرۆدۆن و هەروەها لەلای مارکسی گەنجیش "کە دواتر هەلۆێستەکانی توونـد کردووە"، وای دەبینن کە هەوڵی گشتگیری لە کۆمەڵگا و لای ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە دەبێتە هۆی چوونە ناویەکی بەرهەمی ماددی و بەرهەمی روحانی، بەو پێیەی لە ناو پەیوەندی دیالێکتیکی ئاڵۆزدا بوونیان هەیە، بۆیە پرۆدۆن جەختی لەسەر ئەوە دەکرد، پێویستە کۆمەڵناسی رەوشتی و چاکە و گێلی و تاوانەکانی مرۆڤ وەکو بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوە، وەربگرێ، هەروەها ئەو بابەتە هێزی شۆڕشیش دەگرێتەوە کە داهێنەری دەستە و چین و کۆمەڵگاکانە، توانای تێکشکاندنی

حەتمیەتە ئابوورییەکانیشی هەیە، بۆیە پێویستە کۆمەڵناسی تەنها بەلێکۆڵینەوەی هێزی بەرهەمە ماددییەکان، واز نەهێنێ.

پرۆدۆن کە لە"دژپێکە ئا بوورییەکان" هێرشی کردبووە سەر" ئابووری سیاسی کلاسیکی"، بەوەی تاوانبار دەکا، کە باسی لە مەسەلەی تر کردووە و واقیعی فەرامۆش کردووە، ئابووری تەنها بەشێکە لە زانستی کۆمەڵایەتی" واتە بەبێ کۆمەڵناسی ناشێ ببێ، ئەمە ئەو دیدگایە یە، کە دواتر مارکس باسیکردووە." زانستی کۆمەڵایەتی ئەو زانیاریە عەقڵێنراوە رێبازێنراوەیە کە چۆتە ناو هەموو کۆمەڵگا و هەموو بنەما و گشتگیری و بوونییەوە "بەش ١ ل٧٣. کۆمەڵناسی تاکە رێگایە کە دەتوانێ مانای حەقیقی هەموو دژکارە ئا بوورییەکان لە رێگای دانانی لە ناو چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتیدا، ئاشکرا بکات. هەروەها زانستی کۆمەڵایەتی لە هێزی کۆمەڵی و هۆشیاری کۆمەڵی دەکۆڵێتەوە، بە شێوەیەکی تایبەت راڤەی دیالێکتێکە ئابوریەکان دەکا، کە بە پلەیەکی چری جیاواز، لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەیە."کۆمەڵگا سەبارەت بە ئابووریەکی حەقیقیی بوونەوەرێکی زیندوە، کە زیرەکی و چالاکی تایبەتی هەیە لەسەر یاسایەکی تایبەت دەڕوا، کە ناتوانین ئاشکرای بکەین، تەنها لە رێگای تێبینی و چاودێرییەوە نەبێت، بوونی لەسەر شێوەی ماددی دەرناکەوێ "بەڵکو لە رێگای" کاری کۆمەڵی برومسثیوس"ەوە دەردەکەوێ کە ئەو کارە کۆمەڵییە تەنها هێمایەکی کۆمەڵگای بزێوە" متحرك"، بە شێوەیەکی تایبەتیتر نیشانەی کارە، بەتایبەت ئەو کارەی کە ئازادە لە تاڵانکاری، کە دواتر بە چەند قۆناغێك دەگاتە جێبەجێکردنێکی گشتی، بۆ چالاکی کۆمەڵی داهێنەر. لە واقیعیی کۆمەڵایەتیدا دەبینین کە "رۆحانییەت واقیع دەسڕێتەوە، وەك چۆن واقیعییەکان ماددییەت دەسڕنەوە "بەشی ٢، ل١٠٦. کۆمەڵگای ئامادە "موجود" لە رێگای "یەکێتی کاری کۆمەڵی کە ژیان و کار و



هۆشیاری تاك و کۆمەڵ و عەقڵ و دادپەروەری دەگرێتەوە" زۆر لە پرۆسە باڵاکانی Sublimation هێزی کۆمەڵیش دەگرێتەوە.

لەسەرەتادا پرۆدۆن گرنگی بە کۆمەڵناسی چینە کۆمەڵایەتییەکان دەدا و جەختی لەسەر بابەتی ململانێی نێوان بورژوازییەت و پرۆلیتاریا لەسیستەمی کۆمەڵایەتیدا، دەکرد. لێرەدا کەمێك لەو کتێبە دەخوێنینەوە کە قسەی لەسەر دەکەین، کە هەڵویستی خۆی دابەشی سەر دوو چینی کۆمەڵایەتی بووە،:(١) چینی بەڵێندەر و سەرمایەدار و بانکییەکان "کە هەموو ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و کۆی کەل و پەلەکانی بەکارهێنانیان قۆرخ کردوە، (٢) چینی کرێکار و جووتیارەکان، کە ناتوانن نرخی ئەو کەل و پەلانە بدەن تەنها نیوەی نەبێت، ئەستەمە بتوانن بەکارهێنان و دابەشکردن و دووبارە بەرمهێنانەوە بکەن" "بەشی ٣، ل٤٠٨". لەگەڵ ئەوەشدا پرۆدۆن جەختی لەسەر ئەوە دەکرد "گرفتی پرۆلیتاری لە زانستی کۆمەڵایەتیدا بەشداری دەکا، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە یەکەی دامەزراوەیی کۆمەڵگای ئێستا، کارگەیە" ج١. ل٢٣٨.

لەو کتێبانەی کە لەبەندیخانەی سانت بیلاجی نووسیوییەتی، پرۆدۆن تێگەیشتنی بۆ کۆمەڵناسی چینە کۆمەڵایەتییەکان فراوانکرد، ئەوەش لە کاتێکدا لەگەڵ ئەو راڤانەی کە پەوەست بوون بە سەرمایەدارەکان و پرۆلیتاریاکان، باسی "چینی ناوەڕاستیش"ی بۆ زیادکرد، کە لە وەرزێرو فرۆشیار و پیشەوەر و رۆشنبیرەکان پێك دەهات، ئەمانە وەکو پرۆلیتاریاکان دەژیان، بەڵام بەروبوومی خۆیان هەبوو وە بۆ حیسابی تایبەتی خۆیان کاریان دەکرد". لەراستیدا پرۆدۆن دوای ئەزموونە شوومەکەی ساڵی ١٨٤٨ــ ١٨٥١، ناچار بوو گرنگی بەو رێکەوتنە شێمانەیەی "المحتمل" نێوان چینی پرۆلیتاریا و چینی ناوەڕاست بدات، لەو هاوپەیمانییەدا کە ئامانجی هەرەسهێنانی سەرمایەداری و "جێبەجێکردنی شۆڕشی کۆمەڵایەتی" بوو.

بەڵام دواتر راستەوخۆ لە ساڵی ١٨٥٢ هیواکەیان بەتاڵ بۆوە، ئەم بێ ئومێد بوونەش لە کتێبی "فەلسەفەی پێشکەوتن" دا رەنگی داوەتەوە.

لە دوای ئەو پرۆدۆن هەستا چینی پرۆلیتاریای لە چینی ناوەڕاست جیاکردەوە، لە کتێبی "توانای سیاسی چینی کرێکار(١٨٦٥) پرۆدۆن تێبینی کرد، کە بە هۆی واقیعی پیشەسازی پێشکەوتووە کێشەی جووتیاران بۆتە هەمان کێشەی کرێکاری کارگەکان" چاپی ریفیر، ل٦٨-٧٠". ئەمەش هۆکاری ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە ئەنجامی شۆڕشی کۆمەڵایەتییەوە هاتوون کە "یەکێتی نێوان جووتیارەکان و کرێکاری کارگەکان" دروست دەکات. پرۆدۆن لەو کتێبەدا بەشیکردنەوەی کێشەی "هۆشیاری چینایەتی" کۆمەڵناسی چینە کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەمەندکرد، لێرەدا تێبینی دەکرێ کە نموونەکانی پرۆدۆن وەکو نموونەکانی مارکس بوون، بەوەی کە چینە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانن بە شێوەیەکی یەکجارەکی دروست ببن، تەنها دوای بە دەستهێنانی هۆشیاری چینایەتی نەبێت. لەراستیدا ئەو گەشبینییە لە رادەبەدەرەی کە سەبارەت بە لە ناوچوون و روخانی هۆشیاری چینی بورژوا هەیبوو، ئامانجی بە ئاگاهێنانەوەی هۆشیاری چینی پرۆلیتاریا بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا سۆسیالۆجیای پرۆدۆن، شیکردنەوەی سێ جۆری سەرمایەداری دەگرتەوە:

أ ـ ئاژاوەگێڕی پیشەسازی.

ب ـ دەرەبەگایەتی پیشەسازی.

ج ـ ئیمپراتۆریەتی پیشەسازی.



لەراستیدا پرۆدۆن سەرنجی ئەگەری سەرهەڵدانی سەرمایەدارییەکی رێك و پێك و ئاراستەکراوی دابوو، هەرچەند بە چاوی گرنگییەوە لە هێزەکەی نە دەڕوانی، وەکو چۆن بە چاوی گرنگییەوە لەو تروستات Trusts و کارتلە ناوخۆیی و جیهانیانە لە برەوپێدانی سەرمایەداریدا، نە دەڕوانی.

چەمکی "واقیعی کۆمەڵایەتی" کە سۆسیۆلۆژیای پرۆدۆن پشتی پێ بەستبوو، بە تایبەت ـ وەکو باسمان کرد ـ لە هەردوو لێکۆڵینەوەی چوارەم و شەشەمی کتێبی "دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسا". پرۆدۆن هیوا درێژ بوو بەرامبەر لە ناوچوونی دەوڵەت، بە هۆی باوەڕ و گەشبینی خۆیەوە گەیشتە شیکردنەوەیەکی واقعی بۆ دەوڵەت، بەو پێیەی کە زانایەکی کۆمەڵناسی بوو." ئەوشتە چییە، کە واقیعی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی دروست دەکا؟ بێگومان هێزی کۆمەڵێیە ... تاکەکان تەنها نین کە شانازی بە هێزی خۆیانەوە دەکەن، کۆمەڵێش هێزی خۆی هەیە، کارگە لە کۆمەڵێك کرێکار پێك هاتووە، کە کارەکانیان لە یەك ئامانج کۆبۆتەوەو ئەوەش بەدەستهێنانی بەرهەمە، بەو وەسفەی کە کارگەسەنتەرێکە بۆ کۆمەڵ و هێزی تایبەت بە خۆیان هەیە: بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەو بەرووبوومەی کۆمەڵێك کرێکار بەرهەمی دێنێ، زۆر بە هێزتر و پوختره لەو بەرهەمەی کە کرێکارێك بە تەنها بەرهەمی دێنێ، ئەم بەڵگەیەش بەسەر دەستەیەکی ئەکادیمیای تیپی ئورکستراو دەستەیەکی هێزی چەکدار و... هتد دەسەپێ، هەموو ئەم کۆمەڵانە یادەستانە هێزێکی پێکهاتوویان هەیە، بە تایبەت و وەکو دەستە لە جۆر و وزەدا بەسەر کۆی ئەو هێزە سەرەکییەی کە پێکیان دەهێنی، بەرزترە" ((چاپی ریفیر، دادپەروەری، بەشی٢، ل٢٥٨)).

"بەم شێوەیە، لەگەڵ ئەوەی کە هێزی کۆمەڵی بەئاست هێزی تاکی ئیجابیاتی زیاترە، کەچی یەکەم تەواو لە دووەم جیاوازە، بەڵام بوونەوەرە کۆمەڵێیەکان تەواو وەك بوونەوەرە تاکییەکان حەقیقین" ((ه. س. پ)). لە م دیدگایەوە

دەبینین دەوڵەت لە کۆمەڵەکانی جیاواز نییە، هەروەها حەقیقەتیشی کەمتر نییە. "دەوڵەت لە ئەنجامی پشگیری و هاوکاری ژمارەیەك کۆمەڵی جیاوازەوە دروست دەبێت کۆمەڵەکان بە شێوەیەکی کۆمەڵی لە ناو دەوڵەتەوا کێ برکێ دەکەن بۆ برەوپێدانی هێزی نوێ، ئەو هێزەش گەورەتردەبێت بەپێی بەشداریکردنی ژمارەیەکی زیاتر "هـ . س . پ ل٢٥٨. "من جەخت لەسەر ئەوە دەکەم، کە دامەزراوەیەکی سیاسی لە واقیعێکی حەقیقییەوە دێت، نەك لە بەڵگەنامەیەك یا کارێکی ئیمانییەوە "هـ . س . پ ل٢٥٦" زۆر جار ئەم واقیعەکەلێنی تێدەکەوێ، دەوڵەت ئەوەیە کە خەڵکی، سەرەڕای هەموو بێ ئومێد بوونێکیان، خۆیان پێوەی هەڵدەواسن" هـ. س . پ ٢٥٦. "لەگەڵ ئەوەی کە دەوڵەت هزری خۆی هەیە، کە ئەمەش شێوە و هۆشیارییەتی، بەدەربرینێکی تر رێکخستنی دەوڵەت لاشەکەیەتی ... لە ئەنجامدا دەگەین بەوەی کە ئەم وشانە: دەوڵەت، دەسەڵات، حکوومەت، ئاماژە بۆ بوونەوەرێکی حەقیقی دەکەن، چونکە ئەگەر رەگەزەکانی بوون "رۆح، لەش" کۆنەکەینەوە ناتوانێ ببێتە هۆی دروستبوونی نەبوون "ولادة العدم" ل٢٥٤.

لەبەر ئەوەی واقیعی هێزی کۆمەڵی دەوڵەت مەسەلەیەکە و تووێژی لەسەر ناکرێ، ئەمە وامان لێ دەکا "کە ئەوەی پێویستە لێی بکۆڵینەوە، ئەو گیانەیە کە دەوڵەت دەیبزوێنێ، هزرەکەیەتی، بیروباوەڕەکانێتی" هـ . س . پ ل١٧٠. حکوومەتەکان لە رێگاو بە هۆی بیروباوەڕەکانییەوە دەژین و دەمرن. بۆیە بیرۆکە "فکرە" حەقیقەتە، دەوڵەت هەرچەند رێکخستنێکی داشکاو بۆگەنی هەبێ، لەبەرامبەر هەر هێرشێکی دەرەکی و گەندەڵییەکی ناوەکیدا خۆی دەشارێتەوە "هـ . س . پ ل١٧٠. هەرچەند" بیروباوەڕی حکوومەتەکان دەسەڵاتێکی بەڵگەداربێ یانا، تا ئێستا لەگەڵ دادپەروەریدا دژکار بەرهەڵستکارن" کەچی دروستبوونی بیرۆکەی دادپەروەری و هەروەها بیرۆکەی



شۆڕش، تاکە بەڵگەی بوونی دەوڵەتن. لەبەر ئەوە بەدرێژایی مێژوو دەوڵەتێك دروست نەبووە، تەنها مەگەر لەسەر توندوتیژی وخراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و خراپ کردنی هێزی بەرهەم هێن و تالانکاری، نەبێ.

ئەم جۆرە دەوڵەتانە بوو کە پرۆدۆن دژی تێدەکۆشا، بەڵام شێوەی دیموکراسییەکی سیاسی وەردەگرت، بەرونتر شێوەی دیموکراسییەکی موڵکایەتی مافی Regalien جاکوبی وەردەگرت. هەرچەند پرۆدۆن هێرشی نەدەکردە سەر دەوڵەتێك کە لە رێگای دادپەروەرییەوە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ، یا لە رێگای ئابوویەکی سەربەخۆوە دیاری بکرایە، کە خۆی خۆی لەسەر بنەماکانی دیموکراسی پیشەسازی، بەڕێوە ببردایە.

لەراستیدا هەموو ئەمانە دەمانگەیێنێ بە تێگەیشتنێکی گشتی پرۆدۆن، پەیوەست بە واقیعی کۆمەڵایەتییەوە، کە ئەم واقیعەش چوار تایبەتمەندی هەیە:

١ ـ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی سەرەتا خۆی وەك "هێزێکی کۆمەڵایەتی" پێشان دەدا، کە ناکرێ لە هێزی تاکی جیابکەینەوە،" هێزی یەکەم تەواو پابەندە بە کۆمەڵگاوە وەك بنەمای راکێشان بۆ ماددە. کاتێك کۆمەڵگا رێکدەخرێ، بەو کۆمەڵە تایبەتی و بە دەوڵەت و چینیشەوە، هێزی کۆمەڵی خۆی وەك دەسەڵات پێشان دەدات، جا چ مەسەلەکە پەیوەست بێ بە دەسەڵاتی سیاسییەوە یا دەسەڵاتی ئابووری و کۆمەڵایەتی" هـ . س . پ ل٢٦١ــ٢٦٢". هەرچەند ئەو هێزە کۆمەڵی و ئەو دەسەڵاتە ئەگەر زۆر چڕیش بن، ناتوانن بە شێوەیەکی راستەوخۆ ـ بوونی دادپەروەری و یاسا و نموونەی باڵا، بسەپێنن، بەڵام وەك چۆن دەتوانێ دروستی بکا و بناسێنێ، ئاوهاش دەتوانێ دۆخەکە لەبارببەرێ و دووریبخاتەوە. بەم شێوەیە دەبینین چۆن هێزی کۆمەڵی ئابووری لە سیستەمی سەرمایەداریدا، بزر بووە"مغربە"، هەروەها ئەو هێزە لەلایەن

خاوەن کارەکانەوە، ئەوانەی کرێکار ئیستغلال دەکەن دەستی بەسەردا گیراوە. دەبینین چۆن هێزی سیاسی تالانکراوە، لە ولاتێکی دەسەلاتەکیدا "سلطوی" لە بڕی ئەوەی خزمەت بە دادپەروەری بکا، خۆی بەبەرژەوەندی چینی بەگزادەکانەوە بەستۆتەوە، ئەوانەی کە تا دوێنێ خاوەن زەوی بوون ئێستا بوون بە بورژوا. هەرچەند واقیعی کۆمەلایەتی تەنها بەسەر باری هێزی کۆمەڵیدا کورت نابێتەوە. "مادده"، هەروەك پرۆدۆن لە کتێبەکەیدا دەربارەی توانای سیاسی لای چینی کرێکار "باسیکردوە"، "مادده" سەبارەت بە کۆمەڵگا کێشەیەکی شێواوە "عبثية"، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە هێزی کۆمەڵی لە توانای دایە چەند بیروباوەڕ و بە هایەك دروست بکات کە تەواوکاری بێ، ئەوکات دەتوانێ ئاراستەی بکا، ئەمەش بە شێوەیەکی تایبەت بارودۆخی کاری کۆمەڵییە لە تێکوشان دژی تالانکاری.

٢ـ لێرەدا دەگەین بەروخساری دووەمی بوونەوەری کۆمەلایەتی، وەکو ناوەندێك لە نێوان هێزی کۆمەڵی و ئەو بیروباوەڕ و بەهایانەی کە لێوەی سەرهەڵدەدا "بەتایبەت بیرۆکەی دادپەروەری". مەسەلەکە لێرەدا پەیوەستە بە ڕێکخستن و بەیاسادارکردن "تقنين" لە ڕێگای یاسایەك کە توانای دروستکردنی هاوسەنگی هەیە، لە نێوان ئەو ململانێیەی لە ئەنجامی بوونی هێزی کۆمەڵێیەوە دروست دەبێ. ئاشکرایە پرۆدۆن لەو بوارەدا زیاد لە پێویست یاسایی "حقوقي" بووە، ئەو ـ لە ئالۆزکاری واقیعی کۆمەلایەتیدا ـ گرنگییەکی زۆری بە یاسا بەتایبەت یاسای دادپەروەری، دەدا ـ لەلایەك ـ لەلایەکی ترەوە گرنگی بە یاسای کۆمەلایەتی سەربەخۆ، هەرەمەکی، دەدا، ئەو ئەم دوویاسایەی بە مافی دەوڵەتی دەخستە ڕوو، کە لە یاسای ڕۆمانی تەقلیدییەوە سەرچاوەیان گرتبوو.

بۆ ئەوەی دادپەروەر بین بەرامبەر پرۆدۆن و هەمەوو چاکییەکانی پیشان بدەین، رەنگە بتوانین چەمکی "یاسا" بە چەمکی وەك "یاسادارکردنی کۆمەلایەتی"



یا "چاودێری کۆمەلایەتی" بگۆڕین، کە ئەم دوو چەمکە ڕەواجێکی باشی هەبوو لەلای کۆمەڵناسە ئەمریکاییەکان. مەسەلە کە لێرەدا پەیوەستە بە شێواز و یاساو هێماو ئاماژە و دروشم و نیشانەکانی بە هەموو دروشمەکانییەوە، کە لە چوارچێوەی واقیعی کۆمەلایەتیدا یەکدەگرن یا لێك دەدرێن "دوای ئەوە پێویستە چوارچێوەیەك بۆ پرۆدۆن دابنێین لەبەر ئەوەی جەختی دەکردە سەر واقیع، ئەو واقیعەی کە تەنها هێزی کۆمەلایەتی نەدەگرتەوە، بە لکو ئەو یاسا کۆمەلایەتیانەشی دەگرتەوە کە لە هێزەوە سەرچاوەیان دەگرت، هەروەها جەختی دەکردە سەر واقیعێك، کە ئەم دوو پلەیە فرە پەیوەندییەکی دیالێکتێکیان هەیە، کە پرۆدۆن پێشتر هەستی بە ئالۆزییەکەی کردبوو.

لەم کاتەدا دەبینین پرۆدۆن ـ ئەمە مەسەلەیەکە بەڵگەی ئەوەیە کە لە تێپەڕاندنی عەقڵی سەرەتایدا سەرکەوتوو نەبووە هەرچەند ئەو یاسا کۆمەلایەتیانە بگەیشتایە بە سەروەری هێزی کۆمەڵی، کە لە بنەڕەتدا هەر لە وەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئەو هیوای بە دادپەروەری هەر لە ناو کۆمەڵگادا زیاتر دەبوو، ئەگەر بەلای کەمیشەوە لای کۆمەڵێك بوایە لە کۆمەڵەکان. بەلام بۆ ئەوەی ئەم بارودۆخە بەدی بهێنین ـ ئەگەر بە شێوەیەکی بەشەکیش بێ ـ پێویستە دوو مەرج جێبەجێ بکەین، یەکەم هەمەوو ئەو بیروباوەڕ و بەهایانەی کە کار بەرهەمی دێنێ، بەتایبەت کاری کۆمەڵی ڕزگار کراو لە تالانکاری، لە خودی خۆیدا دڵنیا بکاتەوە، دووەم هۆشیاری کۆمەلایەتی سەرکەوتووبێ.

٣ ـ لێرەدا دەگەینە روخساری سێیەم، واقیعی کۆمەلایەتی کە ئەو بیروباوەڕ و بەها کۆمەلایەتیانە دەگرێتەوە کە نموونەی بالاو چەقبەستوی سەر هەستەکانن، ئەو" نموونەی بالایە" ئەگەر بەبیری دادپەروەرییەوە پابەندی بکەین دەبێتە هۆی

بەهێزکردنی وزەی شۆڕش، بەڵام بە پێچەوانەوە دەبێتە رەگەزێکی داروخان. ئەگەر بەهزری دادپەروەرییەوە پەیوەست نەکرێ.

٤ ـ سێ روخسارەکەی پێشووە دەمانگەێنێتە روخساری چوارەم، کە پرۆدۆن پیێ دەڵێ "هۆشیاری هاوبەش" یا "هۆشیاری کۆمەڵایەتی"، کە بە هەڵە بە "عەقڵی کۆمەڵی" و " رۆحی کۆمەڵی" هەتا "عەقڵی گشتگیر" ەوە، لکێنراوە. ئەمە پرۆدۆن لە هەموو کتێبەکانی دا باسیکردووە بەتایبەت لە "دیراسەی حەوتەم " کە تایبەتی کرد بوو بە "بیروباوەڕەکان".

پرۆدۆن گومانی لەوە هەبوو کە "گەندەڵی عەقڵی گشتی "لە رێگای رەهاوە"المطلق" رووبدات، پێی وابوو کە شۆڕشی بورژوازییەت دەتوانێ ئەو عەقڵە گشتییە "پێك بهێنێ، بەڵام بە گوێرەی پێویست کاریگەر نابێ، بەڵکو تەنها شۆڕشی کۆمەڵایەتی" دەتوانێ بەدی بهێنێ. لەلایەکی ترەوە پرۆدۆن جەخت دەکاتە ئەوەی کە "جیاوازیەکی سەرەکی هەیە لە نێوان عەقڵی کۆمەڵی و عەقڵی تاکی "ه . س. پ ل٥٥٠" " ئەم عەقڵە گشتیە هەرگیز کەمتەرخەم "تهاون" نابێ"، ئەمە بە شێوەکی سەرەکی کردەییە، بۆیە ناکرێ لە هەمانکاتدا تیۆری بێ. هەروەها لە شۆڕشەکاندا دەتەقێتەوەو لە دوارۆژدا دەبێتە هۆی سەرکەوتنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی. "من پێموایە کە پێویست ناکات جەخت کردنێکی زۆر بکەینە سەر جیاوازی سەرەکی نێوان عەقڵی تاکی و عەقڵی کۆمەڵی، بە جۆرێك یەکەم رەهایە، دووەم دژی هەر جۆرە رەهاییەکە" ه . س . پ ل٢٥٣.

عەقڵی کۆمەڵی بۆمان روونەکاتەوە کە کۆمەڵگا بوونەوەرێکی مەعنەوییە، بە شێوەکی بنەرەتی لە بوونەوەرەکانی تر"تاکاکەکان" جیاوازە، پابەندکردنی ئەندامەکانیان لە نێوان خۆیاندا، کە ئەمە بێگومان یاسای بوونی کۆمەڵگایە



بۆیە دەبینین کۆمەڵگا هەموو جۆرە بیروباوەڕێك رەتدەکاتەوە کە بانگەشەی پلەبەندی "هیرارکییەت" "المراتبیە" دەکات بەو جۆرەی کە گوزارشتی لێ کردووە، بەم دارِشتەیە، هەموو مرۆڤەکان بە سروشتی لە سەربەرزیدا "الكرامة" یەکسانن، پێویستە لەودیدگای بارودۆخ و سەربەرزیانەوە، بەهاشیان یەکسان بێت" ه . س . پ ل٢٦٥. "ئەو شتەی تر "عەقڵی تاکە"رەهایە، کە بەپێی رێگایەکی دیاریکراو مشت ومڕێکی رووکەشی "الشكلی Syllogisme" کاردەکات، بەردەوام خۆی لە پەیوەستکردنی کەسەکان و کارو رەوشتەکانیان لە پێکهاتەی کۆمەڵگادا، بەدوور دەگرێ، بەڵام عەقڵی کۆمەڵی کە دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی رەها، بە شێوەکی جێگیر لە رێگای هاوکێشەکانەوە، بەڕێوەدەڕوا. بەتوندی هەموو سیستەمێکی کۆمەڵگای پابەند رەتدەکاتەوە" ل٢٦٧.

"ئامێری عەقڵی کۆمەڵی هەمان ئامێری هێزی کۆمەڵییە: کە کۆمەڵێك کرێکارە، یا کاریگەرییەکە، زانایەکە، هونەرمەندێکە، ئەکادیمیا و قوتابخانەو شارەوانییەکانە" ل٢٧٠. بەکورتی هەموو کۆمەڵگا بەگشتی ، بەمەرجێك ئەو بارودۆخانە فەراهەم بکرێ کەرێگای پێ دەدا. پرۆدۆن هەمووکارێکی پراگماتی و لە هەمانکاتدا مەعنەوی دەگەڕاندەوە بۆ عەقڵی کۆمەڵی، لێرەدا بڕگەیەکی بەناوبانگ هەیە کە لەو نامەیەوە وەرگیراوە کە پرۆدۆن بۆ "کۆرنۆ"ی ناردووە، دەڵێ" رەوشت ئاشکراکردنێکە کە کۆ بۆ تاکی، بەدی هێناوە"، ئەو ناتوانی لەلای عەقڵی تاك، بەمەی بەراورد بکا لێرەدا دەتوانین بلێین بیروباوەرەکان دەگەڕێنەوە بۆ کار،؟ واتا بە هۆی عەقڵی کۆمەڵی و پراگماتی بە شێوەیەکی تایبەت، لە دایك دەبێ.

هەرچەند پرۆدۆن دانی بە عەقڵی کۆمەڵی نەدەنا، ئەگەر جۆرێك تێپەڕاندنی تێدا بوایە، یا پاشکۆی لۆگۆس بوایە، نەیدەتوانی پەی پێ ببا. بەم شێوەیە ئەو

ڕێگایە دیاری ناکرێ کە "عەقڵی کۆمەڵی " بەهۆیەوە" هۆشیاری بیروباوەڕکان و ئەو بەهایانەی کە لە کارەوە سەرچاوە دەگرن ـ بەتایبەت کاری کۆمەڵی ـ، کۆدەکاتەوە. بەڵام ڕۆڵی ئەو وەکو ڕوونکەرەوەیەك و جیاکەرەوەیەك لە نێوان ناوەڕۆك و بەروبوومەکانی و هەوڵی کۆمەڵی، مەسەلەیەکە تیشکی نەخراوەتە سەر، لێرەدا خالێکی لاوازی شیکارییەکەی پرۆدۆن دەردەکەوێ، وەکو چۆن دەرگا بەرامبەر ژمارەیەك خراپ تێگەیشتن کرایەوە، بەتایبەت دەق و کتێبەکانی پرۆدۆن کە هەندێ جار سەرنجدانی ئەو "ویستە گشتییە"ی، لە خۆ دەگرت، کە لە جان جاك ڕۆسۆی وەرگرتبوو، پرۆدۆن خۆی چەند جارێك ڕەخنەی لێ گرتبوو. پرۆدۆن دەنوسێ و دەڵێ: "کاتێك دووکەس یا سێ کەس بانگەوازی بیروڕا جیاوازەکانی خۆیان دەکەن دەربارەی مەسەلەیەك، دەرئەنجامی ئەم سێ بیرورا جیاوازە، هاوشانی یەکتر، هەرکەسەو گوزارشت لە خودی خۆی دەکا، یا ئەو ڕەهایەی کە "من" "أنا" جەختی لەسەردەکەم، ئەوشێوازەی کە دیدگا هاوبەشەکانمان پێك دەهێنێ هەرگیز بەیەك ناچن، نە لە ناوەڕۆك و نە لە شێوەشدا، ڕێگای بیرکردنەوەیان تاکییە ئەگەر ئەم گفتۆیە نەبێ "هـ . س . پ ل٢٦١"، بەم شێوەیە هەندێ جار "عەقڵی کۆمەڵی لە ڕێگای هاوکێشەیەك یا هاوسەنگییەکی هەمبەری بۆ بیروڕاکانی تاك، دروست دەبێ " ل٢٦٥." ئێمە دەبینین عەقڵی کۆمەڵی هەمیشە لە ڕێگای هاوکێشەکانییەوە، ئەو سیستەمە تێك دەشکێنێ، کە لە ئەنجامی هاوسۆزی عەقڵی تاکەکانەوە دروست بووە، واتە تەنها ئەوە نییە کە جیاوازبێ لێی، بەڵکو پێشیشی کەوتووە" ل٢٦٨. لێرەدا دەبینین ئەم هەڵوێستە زۆر نزیکە لە هەلوێستی دورکهایم"Durkheim".

لێرەدا دەتوانین، بلێین کە گفتوگۆی پرۆدۆن دەربارەی "عەقڵی کۆمەڵی" لە کۆتایدا ناگاتە ڕێگای داخراو. تێکەڵکێشی نێوان" هۆشیاری کۆمەڵی" و "عەقڵی کۆمەڵی" و بەرزکردنەوەیان بەسەر هێزە کۆمەڵی و یاسا کۆمەڵایەتییەکان دا، کە لێوەی بەرهەم هاتوون، پێویستبوونی دیاریکردنی پەیوەندی نێوان هۆشیاری و عەقڵی کۆمەڵی بە بیروباوەڕ و بە هاکان، لە کۆتایدا نەبوونی شیکردنەوەیەکی بەپێز "واف" بۆ دروستبوونی "عەقڵی کۆمەڵی" لە ناو جەرگەی کاردا، ئەمانە هەمووی چەند مەسەلەیەکن کە بەبێ ململانێ دەبنە هۆی کە مکردنەوەی چالاکی پراگماتی واقیعی، کە پرۆدۆن هەوڵی پەرەپێدانی دەدا.

لێرەدا نابێ لەبیرمان بچێ کە پرۆدۆن لایەنگرێکی سەرەکی دیالێکتێك بوو، بەتایبەت دیالێکتێکی بزاوتی واقیعی کۆمەلأیەتی. لەراستیدا "هۆشیاری کۆمەڵی" و" عەقڵی کۆمەڵی"بەشێکی ئەو دیالێکتێکەیان پێك دەهێنا. هەموو روخسار و پلەکانی واقیعی کۆمەڵایەتی و "عەقڵی کۆمەڵی" تایبەتن بە دیالێکتێك، لەم دیدگایەوە، عەقڵی کۆمەڵێ" تەنها لەحزەیەکە لە ڕێرەوی "گشتگیری" ژیانی کۆمەڵایەتیدا، ڕاستە کە چەمکی "عەقڵی کۆمەڵی" بە تەواوی ڕاست نییە، بە تایبەت کە ئێمە بەدروستی نازانین پرۆدۆن بە تەواوی مەبەستی چییە، ئایا پرۆدۆن بە مانای گشتی وشەکە بیری لە "عەقڵ" کردۆتەوە. هەرچەند پرۆدۆن لە سۆسیۆلۆژیادا گەیشتۆتە، ڕێژەگەرایی پراگماتیکی لوژیکی، لە هەمانکاتیشدا واقیعی و دیالێکتێکیش بوو، بەڵام هەمیشە نەیدەتوانی بگاتە ئەو ئامرازانەی کە بەمەی دەگەیێنی، تەنها چەند چەمکێکی تایبەت نەبێ.

ئێستا روخسارە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی پرۆدۆن دەخەینە ڕوو، دوای ئەو تێروانینە ڕەخنەییانە:

١ - واقیعی كۆمەڵایەتی فرەشێوە و رەهەندە "الشكل و البعد" روخسارەكانیشی جیاوازە ئەویش، هێزی كۆمەڵییە، یاسایە، بەشێوەیەكی فراوانتر، یاسا كۆمەڵایەتییەكان (هێماكان، جۆرەكان، نیشانەكان) دادپەروەری و نموونەی باڵا، ئەمانە هەندێ جار لە نێوان خۆیاندا لە ململانێدان هەندێ جاریش هاوسۆزن، لە كۆتایدا "عەقڵی كۆمەڵی" هاوشێوەی هۆشیاری كۆمەڵێیە.

٢- ئەم واقعیە كۆمەڵایەتییە، گشتگیری دروست دەكا، بە شێوەیەكی روونتر، ناوەڕۆكەكەی لە ناوبزاوتی "گشتگیری" دیالیكتێكیدایە. بنكەی ئەم واقعیە هەوڵ و كاری كۆمەڵێیە، كە كار و روكەشیەكەی زیاتر دەوڵەمەندە. لەرێگای كاری كۆمەڵییەوە، هێزی كۆمەڵایەتی لە كۆی ئاستە گشتگیرەكانی كۆمەڵایەتی بڵاو دەبێتەوە. هەرچەند ئەم بڵاوبوونەوەیە پەیوەستە بە قۆناغەكانی رزگاری كردنی كار لە تالانكاری، لەبەر ئەوە پێویستە شۆڕشی یەك لە دوای یەك هەڵبگیرسێ.

٣ ـ هەرەمەكی كۆمەڵی رۆڵێكی سەرەكی دەگێڕێ، كە لە ماوەی شۆڕشەكاندا بە شێوەیەكی باش دەردەكەوێ، كە بەبێ ئەو نەهێزی كۆمەڵی و نە كار و نە یاسا كۆمەڵایەتییەكان و نەدادپەروەری و نەعەقڵیكۆمەڵی و نەئازادی كۆمەڵی ناتوانن ئەركەكانی خۆیان بەدی بهێنن.

٤ ـ لە هەموو كۆمەڵگایەكدا فرە كۆمەڵی هەیە، بەڵام لە ژێر سیستەمی سەرمایەداریدا چینە كۆمەڵایەتییەكان دەردەكەوێ ، لە نێوانیشیاندا پرۆلیتاریای یەكگرتوو لەگەڵ جووتیار و بەرهەڵستكاری بورژوازییەت. ئەم بەرهەڵستكارییەشی دەبێتە هۆی روودانی شۆڕشی كۆمەڵایەتی، ئەم شۆڕشەش



تەنها "كار" لە تالانكاری رزگارناكات، بەڵكو جەنگە نێودەوڵەتییەكانیش دەگۆڕێ بە جەنگێك كە ئامانجی ملكەچكردنی سروشتە.

٥ ـ فرە سۆسیۆلۆژی كە تێیدا بوونی فرە كۆمەڵی و "زۆر جار چینە جیاوازەكانیش" ململانێی نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگای ئابووری، ئاشكرا دەكات.

٦ ـ هەرچەند كار بە تالانكراوی بمێنێتەوە، نەك هێزی كۆمەڵی بەتەنها، بەڵكو كۆی واقیعی كۆمەڵایەتی لە هەموو پلەكانیدا، ملكەچی خۆپەرستی چینی موڵكدار دەبن، بەتایبەت خاوەن كارگەكان و گەورە سەرمایەدارەكان.

٧ ـ پێشكەوتن ئەو سەركەوتنەیە بۆ ئازادی كۆمەڵی پەیوەستە بە ئیرادە، كە بە هۆی شۆڕشەكان و عەقڵی كۆمەڵی و دادپەروەری هاوسۆز لەگەڵ نموونەی باڵای ویژدانەوە، سەردەكەوێ. هەروەها پێشكەوتن بانگەوازێكە لە پاڵ شۆڕشە نوێیەكان، لە ناو شۆڕشدا ناچارەكی "جبری" و لە خۆوەكی "تلقائی" نییە.

بەڵام دواكەتن و داڕوخان چەند مەسەلەیەكن وەك پێشكەوتن حەقیقی و واقعین، كە لە هەموو شوێنێك تووشی كۆمەڵگا دەبێت، وەكو چۆن تووشی دەستە و چینە كۆمەڵایەتییەكان دەبێ.

٨ ـ بیروباوەڕ و بەهاو دادپەروەری و "عەقڵی كۆمەڵی" لە هێزی كۆمەڵییەوە سەرچاوە دەگرن، ئەوەش لە رێگای بەرزكردنەوەی ئەو هێزەی لە پێناو ئاراستە كردنیدا، بە شێوەیەكی تایبەت لە كارەوە سەرچاوە دەگرێ، هەروەها لە كارەو داماڵینی تالانكاری دەست پێ دەكا، وپێویستە بگەڕێتەوە بۆكار. هێزی كۆمەڵی بەرەوداڕوخان دەچێ ئەگەر پەوەندی لەگەڵ كار بپچڕێنێ، یا ئەگەر لە رێگای تێكۆشان و كار و داهێنان و شۆڕشەوە نە هاتبێتە دی.

٩ ـ تیۆری کۆمەڵناسی پرۆدۆن، ئەگەر بە چاوی گرنگییەوە تەماشا نەکرێ تێگەیشتنی ئاسان نییە، قووڵی و ئاڵۆزی دیالێکتێکەکەی پرۆدۆن، ئەو دیالیکتێکەی کە نە بەسەر هاوسەنگییەکاندا کورت دەکرایە، نەبەسەر ئەو گەڕانەی بەدوای ئەو دژکاریانەی کە چارەسەر نەدەکران، کورت دەکرایەوە. پرۆدۆن بەبێ ئەوەی ئەمە بەروونی دەربخا، هەستی بە پێویستی دیالێکتێکی هەمە چەشن دەکرد بۆ بزاوتی واقیعی کۆمەڵایەتی، ئەو واقیعەی کە هەندی جار لە تەواوکاریدا و هەندێ جار لە بەدوایەکدا هاتووی "أستتباع" هەمبەری دەردەکەوێ، بەڵام هەندێ جار لە لێڵی و هەندێ جاریش لە جەمسەرگریدا دەردەکەوێ، ئەم دیالێکتێکە وای دەکرد تاقیکردنەوەی نوێ بکرێ.

لە ماوەی ئەو خاڵە سەرەکیانەی لە سۆسیۆلۆژیای پرۆدۆندا خستمانە روو باس لە هەندێ بەربەستی بەردەم ئەم سۆسیۆلۆژیایەش دەکەین:

١- پرۆدۆن دوای ئەوەی رووخسارەکانی واقیعی کۆمەڵایەتی خستەروو، کە لە "هێزی کۆمەڵی" یەوە دەستیپێکرد و گەیشتە"عەقڵی کۆمەڵی"، ئەو روخسارانەشی بە پێی گرنگی شوێنەکەی لە ناو واقیعی کۆمەڵایەتیدا، خستە ناو سیستەمێکی پلەبەندی Hierarchique "مراتبی" جێگیرەوە، لە لوتکەوی ئەم پلە بەندیەدا "عەقڵی کۆمەڵی" وەهەوڵی کۆمەڵی ئازاد هەیە، دواتریش دادپەروەری کۆمەڵایەتی پەیوەست بە نموونە باڵای و ویژدان هەیە، لە کۆتایشدا باقی ئەو بیروباوەرو بەهایانەی کە پەیوستن بەیاساوە بەتایبەت یاسا کۆمەڵایەتییەکان، دێ. بەڵام لە پلەی کۆتایشدا "هێزی کۆمەڵی" هەیە، سەرەڕای واقیع ئەو روخسارانەی پێشووتریش هەمووی لەم هێزەوە سەرچاوە دەگرن. ئاشکرایە مەسەلەکە لێرەدا پەیوەست نییە بە پلەبەندی حەقیقییەوە، بەڵکو پەیوەستە بە پایەی بەهاکانەوە، ئەو پایەیەی کە جێگیر و نەگۆڕە، بە پێچەوانەی ئەو واقیع و پراگماتیە رێژەییەی کە پرۆدۆن بە ئاڕاستەی دەڕۆیی.



لێرەدا پرۆدۆن لەگەڵ خۆیدا دەکەوێتە دژایەتییەوە، بەو پێیەی کە پلەبەندی بەهاو روخسارەکان واقیعی کۆمەڵایەتی سەرەوژێر، بەتایبەت بەهۆی ئەو تاڵانکارییەی کە لە هەموو کۆمەڵگاکان تووشی کاری مرۆیی بۆتەوە, جۆرە جیاوازەکانی سیستەمی سەرمایەداری و داروخانی چینی بورژوا رەهەندێکی تایبەت بەم سەرەوژێر بوونە دەدەن پلەبەندی هیچ بەهایەکی نییە، تەنها سەبارەت بەو کۆمەڵگایانە نەبێت کە بە زووترین کات شۆڕشی کۆمەڵایەتی تێدا روودەدا. ئایا زانستیتر نییە کە دان بەوەدا بنێین، کە هەمە چەشنی پلەبەندی ئەو روخسارانەی پێشوو بکەین، بە شێوەیەکی درێژ تر لێی بکۆڵینەوە؟

٢ ـ پەیوەندی بیروباوەڕو بەهاکان، بەعەقڵی کۆمەڵییەوە لەلایەك و بە یاسا کۆمەڵایەتییەکان لەلایەکی ترەوە، زیاتر پێویستی بەوردبینی ودیاری کردن هەیە. هەروەك هەمە چەشنی ئەم پەیوەندیانە زیاتر پێویستی بە قوڵ بوونەوە هەیە ئەو ئاڕاستە هاوشێوەیەی نێوان یاسا کۆمەڵایەتییەکانی تر، ئەو ئاراستە هاوشێوەیەی نێوان دادپەروەری و کۆی بەها ئیجابییەکانی تر ،دەکرێ خۆمان لێیان بەدووربگرین.

٣ ـ پرۆدۆن بە گومان بوو سەبارەت بە چارەنووسی چینە کۆمەڵایەتییەکان، لە کۆمەڵگای دوارۆژدا. پێویستە خاوەن کار و چینی بورژوا بزربن و تێکەڵییەکی هاوسەنگ لە نێوان چینە نوێیەکان جێگایان بگرێتەوە، ئەم گرفتە زۆر لەوە ئاڵۆز تر بوو کە پرۆدۆن بیری لێ دەکردەوە. پرۆدۆن هەرگیز گومانی لەو "فرە کۆمەڵییە" نەبووە کە لە کۆمەڵگای دوارۆژدا دەردەکەوێ، هەرچەند مەسەلەی پەیوەندی نێوان "فرە کۆمەڵی" و "فرە چینایەتی" لە کۆمەڵگای دوارۆژدا، بەروونی نەخستۆتە روو. لێرەدا خاڵێکی لاوازی شیکردنەوەکەی دەردەکەوێ.

٤ ـ له كۆتايدا پرۆدۆن نەگەیشتە جياكردنەوەيەكى روونى نێوان، فرە كۆمەڵايەتى "وەكو ئەمرى واقيع" و فرە كۆمەڵايەتى ياسادارکراو.

پرۆدۆن لەو فرە كۆمەلايەتييەوە كە دەكرا لە پلەى چڕى جياواز تێبينى بكرێ، پەڕيوە بۆ فرەييەك كە ئامانجى شۆڕشى كۆمەڵايەتى بوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەجياوازى لە نێوان فرەييەك و يەكێتى ترداو نە جياوازى لە نێوان ستراتيژييەتى فرەييەكان دەكرد. ئەمانە هەموو چەند مەسەلەيەك بوون كە خزمەتيان بە ئامانجى جياواز دەكرد. بۆ ئەمەش دوو نموونە وەردەگرين:

نموونەى يەكەم لە شۆڕشى گەورەى فەرەنسا وەردەگرين. پرۆدۆن بەوەى كە دژايەتى يەعقوبييەكانى دەكرد، نەيدەزانى چۆن تێبگا كە ئەم تەكنيكە يەكانگير و نێودەوڵەتييە Etatiste، پێويستە بۆ پاككردنەوەى ئەو فرە رەق هەڵاتووەى پيشە كۆنەكان Corporations، ئەو فرەييەى تەنها خزمەت بەتەمەن درێژى ئوتۆكراتى و كۆمەڵايەتى دەكات، هەر تاكتيكێكى تر، غەيرى تاكتيكى چاكسازى ئاست "لەسەرەوە" دەشى لە پێناو لاسەنگكردنى تاى يەكسانى بێ لە رێكخستنى سياسيدا؟

نموونەى دووەم كێشەى "دەست لە ناودەستێكى نوێ" الصفقة الجديدة، " New Deal" كە رۆزفلتى سەرۆكى ئەمريكا دايهێنا. رۆزفلت، بۆ ئەوەى سەنديكا كرێكارييەكان لە ژێردەستى ئەو رێكخراوانە رزگار بكات كە ملكەچى سەرمايەدار و خاوەنكارەكان بوو، ناچاربوو زياتر دەوڵەت و دامەزراوە ئيدارييەكان دەستبخەنە ناو ژيانى ئابوورييەوە، لەم نێوەندەدا دەوڵەت رۆڵى دادوەر دەبينێ لە نێوان سەنديكاى كرێكارييەكان و رێكخراوەى خاوەن كارەكان. ئەم سياسەتانەش تەنها يەك ئامانجيان هەبوو، ئەويش سەربەخۆكردنى سەنديكا كرێكارييەكان و دەستەبەرى ئازادى بزاوتى سەنديكاكان، ئەمەش نەك



تەنها دژى خاوەن كارەكان، بەڵكو دژى دەوڵەتيش بوو، لێرەدا تەكنيكى نێودەوڵەتى يەك ئامانجى هەيە، ئەوەش برەوپێدانى فرە كۆمەڵايەتييەكان بوو، هەرچەند پراگماتييە رێژەگەرايى و ديالێكتێكەكەى پرۆدۆن كە سۆسۆلۆژيايەكى بەپێزو دەوڵەمەند بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خاڵى نەبوو لە هەندێك سەرپێچى دۆگمايى "بيروباوەڕى وشك" ئايا دەتوانين هەمان شت دەربارەى تيۆرەى كۆمەڵايەتى، سياسى بڵێين؟.

**٣ ـ تيۆرى كۆمەڵايەتى و سياسى پرۆدۆن:**

تيۆرى كۆمەڵايەتى و سياسى پرۆدۆن روخسارێكى چوارينەيان هەيە:

أ ـ لەلايەك ئامانجى رەخنەگرتن بوو لە هەموو ئەو تيۆرانەى پێش خۆى و هاوچەرخى خۆى.

ب- لەلايەكى ترەوە مەسەلەى پێشكەوتنى سۆسياليستى زانستى "اشتراكية علمية" بۆ خۆى پێشنيار كرد، "ئەم چەمكە پرۆدۆن دايهێنا و دواتر ماركس دژى بەكاريهێنا"، ئاشكرايە ئەم سۆسياليستەشى بە كۆمەڵناسى پشت بەستوو بوو.

ج ـ لەلايەنى سێيەمەوە بونيادى كۆمەڵگاى دوارۆژى بەم شێوەيە ديارىكرد: ئەو كۆمەڵگايەى شوێنكەوتەى دارشتەى كۆن بێ، رەفتارێكى "ئاژاوەگێڕى ئيجابى" بە خۆوەدەگرێ، بەڵام ئەو كۆمەڵگايەى شوێنكەوتەى قۆناغى كاملبوون بكەوێ رەفتارێكى "ديموكراسى پيشەسازى" پشتبەستوو بە خۆ بەڕێوەبەرى كرێكارى چەقبەستوو بەسەر هاوبەشييەكى يەكگرتوودا كە بۆ "يەكێتييەكى فيدراڵى كشتوكاڵى و پيشەسازى" دەگەڕێتەوە، هەروەك چۆن بۆ هەموو بەشداربوونى كۆمەڵى و تاكى دەگەڕێتەوە، ئەم يەكێتييە فيدراڵييە ئەركى "هاوسەنگكردنى"قورسايى دەوڵەتە، كە بەرۆڵى خۆى سەرەوژێر بۆتەوە.

د ـ له کۆتاییدا ئاماژەی بەو ئامرازە پێویستیانەدا کە بۆ جێبەجێکردنی شۆڕشی پرۆلیتاری پێویست بوون. ئەم شۆڕشە لە ڕێگای پاککردنەوەی سەرمایەداری، گەیشتە پرۆسەی "جیاکردنەوەیەکی سەرتاپاگیری نێوان چینی کرێکار و بورژوازییەت، ئەم جیاکردنەوەیە کەرتکردن و لە کار وەستانی کۆی ئەو دامەزراوە تایبەتیانەی سیستەمی سەرمایەداری دەگرتەوە، هەروەها ڕێکخراوەی نوێنەرەکی سیاسیشی دەگرتەوە هەتا ئەگەر شێوەیەکی دیموکراسیانەشی هەبوایە. لەگەڵ ئەوەشدا پارتێکی کرێکاری سەربەخۆ و پتەوی ڕێکدەخست و خانەیەکی جێبەجێکردنی خودیانەی دروست دەکردو هەروەها پلانی کۆمەڵگای ئابووری دوارۆژیشی دادەڕشت.

لێرەدا هەموو ڕوخسارەکانی ئەو چوار ڕوخسارە دەخەینە ڕوو، کە ئاماژەن بۆ پێشکەوتنی بیری پرۆدۆنی، سەبارەت بە هەریەکێکیان: ـ

أ ـ پرۆدۆن ڕەخنە تیۆرییەکانی خۆی بە پشکنینی ئەو بیانووە جیاوازانەی موڵکایەتی تایبەتی بە ئامرازەکانی بەرهەم هێنان دەست پێکرد، بەتایبەت ئەو بیانوانەی کە لەلایەك لەسەر بنکەی داگیرکردن و لەلایەکی تر لەسەر بنکەی کار، جێگیربوو. پرۆدۆن هەوڵی دا ئەم سێ خاڵە پتەوبکات :

١- کار بە ئاستی خۆی، هێزی بەموڵکردنی کەلوپەلەکانی سروشتی نییە.

٢- هەتا ئەگەر سەرەڕای هەموو شتێکیش بەم هێزەی کار نارازی بین، ئەمە وامان لێدەکا جەخت بکەینە سەر یەکسانی موڵکایەتییەکان، چ ئەگەر جۆری کاربێ، یان کەمی بەروبووم بێ، یا جیاوازی هێزی بەرهەم هێن بێ.

٣- کار لە چوارچێوەی دادپەروەریدا موڵکایەتی تێك دە شکێنێ. "یا دەوەری یەکەم". ل٢٠٥.



ئێستا دوای ئەوەی کاروبارەکان لە ڕووی لایەنگرانی بورژوازییەت، بەستران، پرۆدۆن هەوڵیدا بیانوو بۆ موڵکایەتی ئامرازەکانی بەرهەم هێنان بهێنێتەوە، کە بەدڵنیاییەوە ناوەڕۆکی دەگۆڕێ بەبێ ئەوەی ڕەفتاری بگۆڕێ. هەتا ئەگەر ئەو موڵکایەتییە گشتی بێت و بگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵ کە دەوڵەت بەرجەستەی دەکا، لەم بوارەشدا پرۆدۆن بەبێ چاوپۆشی هێرشی کردۆتە سەر بابۆفییەکان و کابیە و ڕابەرانی کلێسای سان سیمۆنی و لەسەرووی هەمووشیانەوە پازار وانگانتین. پرۆدۆن هەوڵی دا بیانوو بۆ ئەوە بهێنێتەوە کە " کۆمۆنی هەژار بوو" بەسەر موڵکایەتی تاك دا بالاٌ نییە، ل٣٢٥، کە دواتر مارکس پێی دەگوت "شیوعییەتی چەقاوەسو" "اشیوعة الماجنة"، لەم بوارەشدا پرۆدۆن دەیگوت "چ سەیرە! کۆمۆنی بەرنامە بۆ دارێژراو "المشاعیة المنهجة"، ئەو ڕەفزەی بۆ موڵکایەتی هات، کەلە ژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی حوکمی پێشینەیی بەسەر موڵکایەتیدا، تەماشای دەکرد، موڵکایەتی لە قوڵایی دیدگای شیوعییەکانەوە باکگراوندێکی "الخلفیة" شاراوەبوو. ڕاستە ئەندامانی کۆمۆن هیچ شتێکی تایبەتیان نییە، بەڵام کۆمۆنە خۆی موڵکدارە، ئەوان خاوەنی پێدا ویستییەکانی نین بە تەنها، بەڵکو خاوەنی کەسەکان و ئیرادەکانیشن. بە پێی بنەماکانی ئەم موڵکایەتییە سەروەرییە "السیادیة" دەبینین کار دەبێتە داوایەکی مرۆیی هەروەك دەبینین ئەو گوێڕایەڵییە کوێرانەیە کە لەگەڵ ئیرادەیەکی هۆشیار نەدەگونجا، بە شێوەیەکی توند سەرکوتکرابوو. ژیان و بە هەرەو هەموو تواناکانی مرۆڤ دەبێتە موڵکی دەوڵەت کە بەهەوەسی خۆی بەکاری دەهێنی لەبری ئەوەی لە بەرژەوەندی گشتیدا بەکاری بهێنێ، هەروەها پێویستە پارێزگاری لەو کۆمەڵگایانە بکەین کە ئەم تایبەتمەندییەیان تێدایە "ل٣٢٦.

له "دژپێکه ئابوورییەکاندا" پرۆدۆن جارێکی تر هێرشەکەی بەشێوەیەکی سنووردار تر رووبەڕووی کۆمەڵەی مەرکەزی و نێودەوڵەتی دەکاتەوە "جماعیة مرکزیة و دولتیة"، بەتایبەت ئەو هێرشکردنەی سۆسیالیستی چاکسازی دەگرتەوە کە لویس بلانس "Louis Blanc" بانگەشەی بۆ دەکرد. هەروەها هێرشەکەی شۆڕشی "١٨٤٨" یشی گرتەوە. لەو کتێبانەی دواتر هات ئەو شکستەی روون کردەوە کە تووشی "کارگە نەتەوەییەکان" بۆوە، کە (لویس بلانس) ی وەزیری کاری حکوومەتی کاتی خاوەن دەست پێشخەری بوو تێیدا، لویس بلانس لە "رێکخستنی کاردا" بە ئارەزووی خۆی قۆرخکاری ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی گەڕاندەوە بۆ دەوڵەت، لە مەشەوە ئاشکرا دەبێ" کە هیچ شتێك لە سۆسیالستی "نێودەولەتی" نییە، ئەگەر لە ئابووری سیاسیدا نەبێ "بەشی١، ل٣٨٢". "سەرمایە و دەسەڵات ـ ئامرازی ناوەندەکی یارمەتیدەرن لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا ئەمانە "سەرمایە و دەسەڵات" دوو خودان کە سۆسیالیستی "دەوڵەتی" دەیانپەرستێ. ئەگەر نەشێ دایان دەهێنین، سۆسیالستی چاکسازی لە رێگای سەرقاڵبوونی بە دەسەڵات و سەرمایەوە مەغزای "مەبەست" ناڕەزاییە تایبەتییەکانی خۆی فەرامۆش کردووە" ل٢٨٤.

هەموو لایەنگرانی کۆمەڵەی مەرکەزی "لەوەهمێکی نامۆیان خواردۆتەوە: بە هۆی دەمارگیریان بۆ دەسەڵات، وای پیشان دەدەن کە لە رێگای هێزی مەرکەزییەوە کۆمەڵگایەکی نوێ بەرهەم دێنن" ل٢١١. هەرچەندە لێرەدا خاوەن ماڵ هیچ هەست و سۆزێکی نییە و بوونەوەرێکی نامۆی رەقە و بەتاڵە لە هەموو ویژدان و خۆشەویستیەك، کە تەنها لە ناو چوارچێوەی بیری خۆی دەجولێتەوە، وەکو چۆن "گا" لە میانەی دانەوێڵەوە دەجولێتەوە. لە راستیدا مولکایەتی بە تەنها گۆرینی بۆ مولکایەتییەکی کۆمۆنی "المشاعیة" بە



کۆمەڵایەتی نابێ: ئەگەر نەخۆشی هاری "داء الکلب" چارەسەر نەکرێ هەموو خەڵکی قەپاڵ دەگرن ـ واتا گەزە لەیەکتر دەدەن" بەشی٣، ل٢٢٣. لەگەڵ ئەوەی مولکایەتی تەنها قۆرخکارییەکە، کە بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستی هێزی دووەم، دەبینین مولکایەتی بە شێوەیەکی کۆمۆنی لە لاسەنگکردنی دەوڵەت و پیرۆزکردنی پۆلیس زیاتر نییە"،"شیوعییەت ـ لەلایەکی تەواو پێچەوانەوەـ بەرهەمهێنانی هەموو ناکۆکییە ئابوورییە سیاسییەکانە" ل٢٥٨.

کۆمەڵی مەرکەزی "بەخواستنی بۆ ئەو وتەزایە" وتەزای دەوڵەت" لە پێناو بە دەست هێنانی لەش و رووبەیەك بۆی، تەنها لایەنی کۆنەپەرستییەکەی لێ وەرگرت. بەڵکو لە هەموو بێ توانایی خۆیدا شێوازی رێکخستنی پۆلیسی وەرگرت، وەکو جۆرێك رێکخستن لە بواری پیشەسازیدا بۆی" بەشی٢، ل٢٩٣. "لە نێوان هەموو حوکمە پێشینەیەکان، بیرۆکەیەك کەلە هەموو ئەوانی تر زیاتر گاڵتە بە خەیاڵ دەکات بیرۆکەی دیکتاتۆرییە: دیکتاتۆری پیشەسازی، دیکتاتۆری بازرگانی، دیکتاتۆری فیکر، دیکتاتۆرییەت لە ژیانی کۆمەڵایەتی و تایبەتدا، یا دیکتاتۆرییەت لە هەموو جێگایەك" ل٣٠١. بەڵام ئاشکرایە "هەرکەسێك بیەوێ لە پێناو رێکخستنی کاردا پشت بەدەسەڵات و سەرمایە ببەستی ئەوە درۆزن و فێلبازە، چونکە لە رێکخستنی کاردا پێویستە دەسەڵات و سەرمایە رەتبکرێتەوە" بەشی١، ل٣١٠.

بەم شێوەیە پرۆدۆن دەگاتە ئەوەی، کە مرۆڤایەتی وەك پیاوێکی سەرخۆش وایە کە لە نێوان دوولایەندا سەما دەکا، لەلایەك مولکایەتی و لە لایەکی تر کۆمۆنەی سەرەتایی و دەوڵەتی Etaisme، مەسەلەکە لەسەر ئەو زانیارییە چۆنایەتیە وەستاوە، کە مرۆڤایەتی بە هۆیە ئەو رێگوزەرەی پێ تێدپەڕێنی، کەسەکە، گێژ دەخواو پێیەکانیش لێك دەئاڵێن" بەشی٢، ل٢٦٦.

لە دوای ئەزموونی تراژیدیای ١٨٤٨ دا، هەروەها لە دوای راپەرینی کرێکارانی کارگەی نیشتیمانی لە حوزەیران، کە راپەرنێك بوو لە خۆیدا قسەکەرێك بوو بە ناوی کۆنگرەی کۆمەڵەی نیشتمانی بەناوبانگ لە ١٣تەمووز، پرۆدۆن لە دوای ئەو راپەرین و ئەزموونەوە هێرشەکانی دژی لویس بلانس توندترکرد، لە نامەیەك بۆ لویس بلانس ١٨٤٩ـ ١٨٥٠، پرۆدۆن لویس بلانسی بەوە تاوانبارکردووە کە بەهۆی ئەو چاکسازی و پیرۆزکردنانەی کە بۆ دەوڵەت کردی خیانەتی لە شۆڕش و کێشەی چینی پرۆلیتاریا کرد. لە پێشتریش لە پیرۆزکردنی شۆڕشی ١٨٤٨، پرۆدۆن بەتوندی رەخنەی لە هەموو ئەو ئاهەنگانەی گرت کە حکوومەتی کاتی بڕیار لەسەردرابوو، ئەو ئاهەنگانەی لە توانایان دا نەبوو هیچ بکەن تەنها سەرخۆشکردنی پرۆلیتارییەکان نەبێ، بەبێ ئەوەی هیچیان بدەنێ یا پێشکەش بکەن". ئەمە هۆکاری ئەوە بوو کە پرۆدۆن نکۆڵی لە هەر توانایەکی شۆڕش دەکرد لەلای دەوڵەت، بەدوو وشە کە بۆ لویس بلانسی نووسیبوو دەڵێ: "دەمانبینی کە نکۆڵی لە حکوومەت و دەوڵەت دەکەین، ئەوەش لە بەر ئەوەی کە ئێمە جەخت لەسەر کەسایەتی و جەماوەر و سەربەخۆیی بوونیان دەکەین، لە "بنەمای گشتی شۆڕش لە سەدەی نۆزدەدا" یا "چەند لێکۆلینەوەی هەڵبژێردراو لەسەر مومارەسەی شۆڕشی و پیشەسازی" ١٨٥١، پرۆدۆن دەڵێ" کرێکاران چ بەمە بزانن یا نەزانن گرنگی کارەکانیان لە وەڵامدانەوەی بەرژەوەندییە بچوکەکانییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو گرنگی ئەوکارە لە رەتکردنەوەی سیستەمی سەرمایەداری و شلۆقی حکوومەت سەرچاوەی گرتووە" ل١٧٦. "شۆڕش لەسەرووی کۆمارەوە وەستاوە"ل٣٥١.

لەهەمانکاتدا پرۆدۆن هێرشی دەکردە سەر "فۆرییە" لە کتێبی "هۆشداری بۆ موڵکدارەکان" کە بە "نامەیەك بۆ کونسیدیران" ناسراوە، بەڵام "یادنامەی



سێیەم دەربارەی موڵکایەتی "یشی پێ دەڵێن، پرۆدۆن پارێزگاری زۆر و گەورەی دەربارەی بڕوابوون بە چاکییەکانی بنەمای هاوبەشەکی "الشراکة" کردوە. پرۆدۆن جارێکی تر لە "سەرهەڵدانی سیستەم لەلای مرۆڤایەتی" جەخت دەکاتەوە سەر ئەم شێوازە، پرۆدۆن کاتێك چەمکی "زنجیرە"ی"Serie" لە فۆرییە وەرگرت و بە واتایەکی جیاواز بەکاری هێنا یا پەیوەستبوونی لەگەڵ دیالێکتێکدا بەکاری هێنا. هاوبەشەکی "الشتراکة" لە ژێر سیستەمی سەرمایەداری و موڵکایەتی تایبەتدا تەنها تاریکاییەك بوو، کە ئامانجی فێل کردن بوو لە پرۆلیتارییەکان. "هەروەك لە" بنەمای گشتی شۆڕشی لە سەدەی نۆزدەدا" دەڵێ" هاوبەشەکی هیچ هێزێکی سەرسووڕهێنەرانەی نییە" ل١٥٨ لەو رەخنانەی کە ئاراستەی فۆرییەی کرد بوو، فۆرییەی بە تۆباوی تۆمەتبارکردبوو- پەیڕەوکارانی نموونەباڵای خەیاڵی ـ : "کەواتە هاوبەشەکی چییە؟ تەنها بیروباوەڕێکی ووشکە "دوگما". لەراستیدا ئەو پێکهاتە سۆزداریانەی کە فۆرییە پشتی پێ دەبەست، هیچ ئەنجامێکی لێ نەکەوتووە". هەروەها پرۆدۆن، سان سیمۆنییەکانی بەوە تۆمەتبارکرد کە ـ لە ژێر سێبەری سەرمایەداریدا- رێکخەر و ئایدیۆلۆژیستی سەرەکی بوون بۆ دەرەبەگایەتی پیشەسازی". لەراستیدا ئەم چەمکە فۆرییە دایهێنا و لەلایەن "ئینفاتین" "Enfatin" ەوە گشتێنرا، کە لە کتێبێك دەربارەی جەزائیر بەکاری هێنابوو، لەسەر بنەمای ئەو بەرنامەیە بە خۆی. ئێمە دەزانین کە ئەو ناکۆکییەکەی کە لە نێوان پرۆدۆن و "بیرێر"ی پارێزگار "کەوتەوە، مەسەلەکە پەیوەست بوو بە دانانی پرۆژەی دروستکردنی هێڵی ئاسنینی نێوان بیزانسۆن و بلفۆر. پرۆدۆن رازی نەبوو بە قەرەبووکردنەوەی ئەو قازانجکەرە دڵخۆشە "واتە" بیرێر" دەیووت" بیرێر نوێنەر و رابەری بنەمای "بیری" سان سیمۆنی پەیوەست بە دەرەبەگایەتی پیشەسازییە". پرۆدۆن بەقێزەوە باسی بانکییەکان "المصرفین" و

خاوەن پیشەسازییە سان سیمۆنییەکانی دەکرد، کە لە قۆناغی دووەمی ئیمپراتۆرییەتی دوومدا پەراوێزێکیان بۆ لویس پۆناپرت پێك دەهێنا. لەلایەکی ترەوە جێبەجێکردنی پرۆژەی (فردینان دی لیسبس) سان سیمۆنی، لە ناوچەی سوێس لە میسر "پرۆژەی کەناڵی سوێس" لەلایەن پرۆدۆنەوە هەمان کاردانەوەی هەبوو، چونکە هەموو خراپییەکانی سەرمایەداری ڕێکخراوی تیادەبینی کە چاودێری پرۆژەکەی دەکرد.

لە پێناو کۆتایی هێنان بەو ڕەخنانەی کە شیکردنەوە تیۆرییەکانی پرۆدۆنی پێ نە خشێنرابوو. باس لەو ڕەخنانە دەکەین کە پرۆدۆن ئاراستەی تیۆرەکانی سیستەمی تێپەڕاندن "تجاوزی" وەك لەلای دی بەناڵدو دی میستەر هەیە) یابە سیستەمی پۆزەتیڤیزمی بێ "وەك لەلای ئۆگست کومت هەیە"، یابە سیستەمی ڕێککردن" التناسق" وەك لەلای لیبنیتز و دواتر لای فۆرییە هەبوو". دەبینین کە "سەرهەڵدانی سیستەم لەلای مرۆڤایەتی" جەخت دەکاتە سەر ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەو چەمکانەی لەسەر ڕێکخستنە پابەندەکان و فرەییەکان و دژکارییەکان، کە ڕێکخستنی هەمیشە لە حاڵەتی داهێنەرانەدا دەژی. نووسەر پشتگیری ئەم تیۆرەییەی لە کتێبی "بنەمای گشتی شۆڕش لە سەدەی نۆزدەدا" کرد کاتێك دەیووت "لێرەدا ڕێگای جیاواز هەیە بۆ پەی بردن بە مەسەلەی سیستەم" ل٣٠٢، بەمانایەکی تر ئەو شتەی کە لە چاوی کۆمەڵێکی دیاریکراوەوە یا کۆمەڵگایەك یا چینێك سیستەمە "Order"، دەتوانین بڵێین لەدیدگای بەرامبەرەکانیانەوە ئاژاوەگێڕییە disorder. بەم شێوەیە پرۆلیتاریا لە پێناو دروستکردنی سیستەمێك لە ناکۆکی دایە لەگەڵ سیستەمی تایبەتی بورژوازییەت و سیستەمی سەرمایەداری.

ب ـ چەمکی "سۆسیالیستی زانستی" کە پرۆدۆن لە کتێبی "یادەوەری یەکەم دەربارەی موڵکایەتی" دایهێنا ل٣٣٩، کە دواتر بەکەمی بەکاری دەهێنا، ئەم



چەمکە لای مارکس هەمان واتای نەبوو، مارکس دوای ئەوەی ئەم چەمکەی لە پرۆدۆن وەرگرت دژی خۆی بەکاریهێنا، سۆسیالیستی زانستی لای پرۆدۆن تۆ باوی دەکوژێ جا چ بە ئامانجەکەی بێ یا بەو ئامرازانەی کە پێی دەگاتە ئەو ئامانجە. هەموو ئەو تیۆرانەی بانگەشەی کۆمەڵی مەرکەزی دەکەن دەوڵەتی بن یا نا، تیۆرەیەکن دژ بەزانست ئەوەش لەبەر ئەوەی هەر لەسەرەتاوە موڵکایەتی دەوڵەت دەسەپێنن، بەڵام موڵکایەتی و دەوڵەت هەر لە سەرەتای دروستبوونی جیهانەوە تێك شکاون. "موڵکدار و دزو پاڵەوان و شا چونکە هەمووی یەك مانان ـ ئەمانە ناوگەلێکن دژ بە سۆسیالیستی، کە مەحکومن بەرەو لە ناوچوون، بەو شێوەیەی کە "زانستی کۆمەڵایەتی" بۆمان روون دەکاتەوە. لەم دیدگایەوە خەونی سۆسیالیستی و سۆسیالیستی چاکسازی و شیوعییەت و لیبراڵییەتی ئابووری، یەك بە یەك هەموویان چەقبەستووی سەر وەهمێکن بە کۆمەڵگایەکەوە کە خۆی خۆی ململانێکانی جێبەجێ بکات، بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەمەیە، چونکە هەر ململانییەك پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی بەردەوامە بۆ دۆزینەوەی هاوسەنگییەکی هەمیشە نوێبۆوە، هەرچەند دژکارە نوێیەکان بەشێوازی نوێ دەردەکەون. بەم شێوەیە بەرای پرۆدۆن ئەو ئامانجانەی کە مارکس دوای کە وتووە ئامانجی تۆباوین، وەکو چۆن بەڕای مارکس پرۆدۆن "تۆباوییەکی بورژوازی بچووکە". ئاشکرایە ئەو هێڵە جیاکەرەوەیەی نێوان "سۆسیالیستی زانستی" و " سۆسیالیستی تۆباوی هێلێکی ڕێگرە بە شێوەیەکی زۆر وریاییەوە، بە تایبەت کە دۆزینەوەی هەر ئامانجێك یا هەر بەهایەکی چاوەڕوانکراو لە هەر زانستێك لە زانستەکان شتێکی قورس و ناخۆشە.

مەسەلەکە تەواو جیاوازە ئەگەر مەسەلەی ئەو ئامرازانە بێت کە بۆ گەیشتن بە سۆسیالیستی پشتی پێ دەبەسترێ. لێرەدا لەم خاڵە هەست بە ناکۆکی نێوان

مارکس و پرۆدۆن دەکەین کەمتر لەوەی پێشبینیمان دەکرد. سەبارەت بەم دوو تیۆریستانە، سۆسیالیستی لەسەر شیکردنەوەی هێزە دەرپەڕیوەکان وەستاوە کە لە ژێر سیستەمی سەرمایەداری دا کەڵەکەبووەو گۆرەپانێك بۆ هاتن و سەرکەوتنی شۆڕشی کۆمەڵایەتی ئامادە دەکات. سەبارەت بەمارکس و پرۆدۆن پێکەوە بەختی سەرکەوتنیان لە گەشەسەندی وزەی شۆڕشی و ئاستی هۆشیاری چینایەتی لای پرۆلیتاریا دەرکەوت، سەبارەت بە وزەی شۆڕش و هۆشیاری چینایەتی، دەبینین هەرچەند سەرمایەداری بچوایە قۆناغی ڕێکخستنی خۆیەوە، مومارەسەکردنی بورژوازی بۆ ئەرکە کۆمەڵایەتییە بە کەڵکەکان کەمتر دەبۆوە. لەم بوارەدا ئەم دوو تیۆریستە، سەبارەت بە درێژەی ئەو شیکردنەوە کۆمەڵناسییە بیروڕای جیاوازیان هەبوو. لێرەدا پرۆدۆن شۆڕشگێرتر بوو لە مارکس، بەڵام لە هەمانکاتدا مارکس واقعبینانە تر بوو لە پرۆدۆن. پرۆدۆن لەبەر ئەوە شۆڕشگێر تر بوو، چونکە گرنگییەکی زۆری بە دەست پێشخەری داهێنەرانەی پرۆلیتاریا دەدا، ئەو دەست پێشخەرییەی کە دەیتوانی حەتمیاتە کۆمەڵایەتییەکان تێك بشکێنێ و کۆنترۆلیان بکا. هەروەها کەمتر واقعبینانە تر بوو، چونکە: زیادەڕۆیی دەکرد لە پێشبینی لە ناوچوون و تێکشکان و لاوازی بورژوازییەت، کە پاڵی پێوەدا بۆ ئەوەی بڕوای بەحەتمییەتی شۆڕشی کۆمەڵایەتی و ئەو سەردەمەی کە سەرمایەداری ڕێکخراو لە بواری جەختکردنەوەی خۆیدا بەرەو لە ناوچوون دەچێ ، هەبێ. بێگومان پرۆدۆن لە هەموو ئەو حالەتانەی کە پێی وابوو سەرمایەداری بنەچەیەکی "الاصل" بیانی هەبوو، زیاتر لە مارکس ڕاستر بوو، کە سەرەتا سەرمایەداری شوێن پێی خۆی لە روسیاو وڵاتە هاوسێکانی قایمکرد، دواتریش لەو وڵاتانەی کە تازە لە ژێر دەستی داگیرکەر رزگاریان ببوو، بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە وڵاتە رۆژئاواییەکان



بێگومان پرۆدۆن بە هەڵەدا چووە... ئاشکرایە سۆسیالیستەکەی مارکس، سەبارەت بەو وڵاتانە سۆسیالیستەکی زیاتر زانستی بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا بە هەڵە داچووین ئەگەر ئەو فکرەیە بدەینە پاڵ پرۆدۆن کە دەڵێ دیکتاتۆری پرۆلیتاری "ئامرازێك نییە بۆ گەیشتن بە شۆڕشی کۆمەڵایەتی و پۆلینکردنی سیستەمی سەرمایەداری، هەروەك هەندێ مارکسییە رەسمییەکان دەیانووت. لە کتێبی "بەپیرۆزکردنی رۆژی یەکشەمدا" پرۆدۆن دەڵێ: "ئێمە بانگەشەی هێز دەکەین ... ئەی مولکدارەکان پارێزگاری لە خۆتان بکەن .... جەنگ لە گۆڕێدایە" ل٩٤ـ٩٥. لە کتێبی "دژکارییە ئابوورییەکاندا" داوای داماڵینی مولکایەتی لە چینی سەرمایەدار دەکا، بەتووندتیژی و بێ قەرەبووکردنەوە" بەشی١، ل٢٧٥ـ٢٧٦. هەروەها دەڵێ :"لێرەدا هێزی گەورە هەیە کە بۆ ئەم دۆخەی کۆمەڵگا پێویستە پشتی پێ ببەستین، ئەم هێزەش سەرمایەداری ملکەچی گەل دەکات و دەسەڵاتیش بۆ گەل دەگەڕێنێتەوە" ل٣٤٨. بەم شێوەیە تا ئەوکاتەی پرۆدۆن خەونی بە "ئاژاوەگێڕی ئیجابی" دەبینی دانی بەوەدا دەنا کە کۆنترۆلکردنی سیاسی دەسەڵات لەلایەن پرۆلیتاریاوە زۆر گرنگە بۆ گەیشتن بە "ئاژاوەگێری ئیجابی"، ئەمەش لە پێناو لە ناوچوونی دەوڵەت لە هەمان ئەو کاتەی کە بورژوازییەت لە ناو دەچێ. ئەوەش ئەو هەڵوێستە بوو کە لە وتارەکەی ٣١ تەمووزی ١٨٤٨و کتێبەکانی دواتر پێشبینی کردبوو. ئەمە زیاتر لەو کاتەدا سنووردارکرا کە پرۆدۆن وازی لە نموونە باڵای ئاژاوەگێڕی ئیجابی هێناو دەستیکرد بە قسەکردن دەربارەی توانای سیاسی چینی کرێکار: لەو کتێبەی کەبەم ناونیشانە کراوە، دەبینین کۆی دێرەکانی بانگەشەی زەرورەتی تێپەربوون بە قۆناغی پۆلیتاریای دیکتاتۆریدا دەکەن. لێرەدا دەبینین ئەو جیاوازیانەی کە لە مارکس جیادەکاتەوە چەند جیاوازییەکی بچووکن، دواتر کە وازی لە

ئومێدی لە ناوچوونی یەکجاری دەوڵەت هێنا، لەم کاتەدا بەتایبەت زیاتر لە مارکس واقیعبینانەتر بوو.

ج ـ لێرەدا هەڵدەستین بە خستنەرووی ئەو ڕێگایانەی کە پرۆدۆن کۆمەڵگای دوا ڕۆژی تێدا خستۆتەڕوو، کە شۆڕشی کۆمەڵایەتی تیایدا سەرهەڵدەداو نموونە باڵای پرۆدۆنی تێدا بەرجەستە دەبێ، ئەمەش بەرێگایەکی سنووردار تر. لە کتێبی "بەپیرۆز کردنی ڕۆژی یەکشەم" دا یەکەم دارشتەی ئەو کۆمەڵگایەی خستەڕوو، ئەو دارشتەیەی کە تا ئێستا دارشتەیەکی گێلانەیە، چونکە دەڵێ :"ئامانج بوونی حاڵەتێکە لە دادپەروەری کۆمەڵایەتی کە نە دەرەبەگایەتیەو نە چەوسێنەرانەیە و نە بەشەکییە و نە ئاژاوە گێڕییە، بەڵکو بریتییە لە ئازادییەك لە ڕێکخستندا و سەربەخۆییەك لە یەکێتیدا "الاستقلال في الوحدة" ل٦١.
دوابەدوای ئەوە سەلماندی کە فرەیی لە ڕێکخستنی پابەندەوە هەڵقوڵاوە بەردەوام پێویستی بە داهێنانەوە هەیە. پرۆدۆن لە نێوان ئەو ڕێکخستنانەدا هەوڵی دا هاوسەنگییەك بدۆزێتەوە کە دەستەبەرییەك دژی هەموو هێزێك یا دەسەڵاتێك پێشکەش بکات، کە چ لە دەوڵەتەوە یا کۆمەڵگایەکی ئابوورییەوە هاتبێ، نموونەی ئەم هاوسەنگییەش لە فیدرالییەتێکی ئابووری و سیاسیدا دێتەدی.

سیستەمی فیدراڵی سەبارەت بە پرۆدۆن ئامانجی ئەو هاوسەنگیانەیە کە هەوڵی دەدا لە نێوان یەکێتی کۆمەڵگایەکی گشتگیر یا لە نێوان چەند کۆمەڵەیەکی تایبەتدا یا لە نێوان گروپ و تاکەکان یا لە نێوان دەسەڵات و ئازایدا، بیدۆزێتەوە. پرۆدۆن دەیووت "بێگومان سەدەی بیستەم سەدەی فیدرالییەتە، سەردەمێکە کە پاکژێتی مرۆڤ هەزار ساڵ دەخایەنێ" بنەمای فیدراڵی چاپی ریفیر ل٣٥٥ـ٣٥٦.



"هەرکەسێك بانگەشەی ئازادی دەکا، با بانگەشەی فیدرالیەت بکا یابێ دەنگ بێ "

"هەرکەسێك بانگەشەی کۆماری دەکا، با بانگەشەی فیدراڵیەت بکا یابێ دەنگ بێ"

"هەرکەسێك بانگەشەی سۆسیالیستی دەکا، با بانگەشەی فیدراڵییەت بکا یابێ دەنگ بێ" ل٣٨٣.

پرۆدۆن دەستیکرد بە بەڵگە هێنانەوە بۆ تیۆرەکەی سەبارەت بە فیدرالییەتی سیاسی، کە لەڕاستیدا فیدرالییەتێکی تەواو نەبوو بەڵکو کۆنفدراڵی بوو، بەڵام لەوکاتەدا پەی بەجیاوازی جێگری نێوان ئەو دوو سیستەمە نەدەبردرا.

"ئەوەی روخسارو ناوەڕۆکی پەیمانی فیدراڵی دیاری دەکا، ئەوەیەکە پەیمانبەستووەکان "المتعاقدين"، لەم سیستەمەدا مافگەلێك و دەسەڵات و موڵکایەتییەکیان بۆ خۆیان دەپاراست زیاتر لەوەی وازی لێ دێنن" ل٣١٩.

ئەو شتەی کە لە کونفدراڵی سیاسیدا لە زیرەکی پرۆدۆنی کەم دەکردەوە، هەڵوەشانەوەی بێ بیانووی دەوڵەت و گۆرینی بەکۆنترۆڵی ماف بوو، واتا هەڵوەشانەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی بە هۆی دەسەڵاتی تایبەت و کۆمەڵە ناوخۆییەکان، لەم دۆخەدا لە توانای کۆنفدراڵی سیاسی و نامەرکەزی ئامرازە گشییەکان بوو کە دەوڵەت بگۆڕن، لەوکاتەدا دەوڵەت بەسەروەری کۆتایی دەهات "بەرێزی نێوان هاوتاکانی"، هەروەك پرۆدۆن پێشتر لە کتێبێکی بچووکی کۆندا باسیکردووە بەناوی "تیۆرەی باج".

"ئاشکرایە بیرۆکەی فیدرالییەت بەرزترین بیرۆکەیە کە بلیمەتانی سیاسەت تا ئێستا پێی گەیشتوون" ل٣٥٢. لەگەڵ ئەوەشدا پرۆدۆن هەرگیز پێی وانە بووە

کە کۆنفیدرالی دەبێ دەوڵەتێکی زۆر فراوان بگرێتەوە، بەڵکو دەیووت "بیرۆکەی کونفدراڵییەتێکی جیهانی" بیرۆکەیەکی ناتەواوە "هەتا ئەوروپا زۆر لەوە فراوانترە کە یەك کۆنفدراڵی بێ : بۆیە ناتوانێ لە کۆنفدرالییەکی کۆنفدرالییەتەکان کەمتربێت" ل٣٣٥" کە واتە کۆنفدراڵی پێویستە لە چەند کۆمەڵەیەکی ناوخۆیی قەبارە بچووك و مام ناوەندی پێك بێ "ل٣٣٥. لە چوارچێوەی کۆنفدراڵی سیاسیدا مافی هەموو دامەزراوییەکە کە ببێتە کۆسپ لە بەردەم هەر ئاراستەیەك کە دەسەڵاتی سیاسی بەرەو گەندەڵی و خراپەکاری ببا. لەبەر ئەوە دەبینین پرۆدۆن دەڵێ پێویستە چینی کرێکار ئەو دامەزراوەیە یا ئەو سیستەمە هەڵبژێرێ کە بڕیاری ئەوە دەدا سیستەمی سۆسیالستی جێگای سیستەمی سەرمایەداری بگرێتەوە.

لەبەر ئەوەی کە بەتێروانینی پرۆدۆن فیدراڵی یەکێکە لەو ئامرازە سەرەکیانەی کە یارمەتی لە ناوچوونی ڕێکخستنی ئابووری کۆمەڵی دەوڵەت دەدا، پێویستە مافی سیاسی لەبەرامبەر مافی ئابووری دابنرێ" بە واتایەکی تر پێویستە کۆمەڵە ئابوورییە ڕێکخراوەکانی "لە دیموکراسی پیشەسازیدا" کاربکەن بۆ لغاوکردنی دەوڵەت نەك برەوپێدانی. ئاشکرایە کە چینی کرێکار لە فیدرالییەتێکی سیاسیدا ئەگەر چینی سەرمایەدار و بانکییەکان هەڵنەوە شێتەوە و ڕێکخستنێکی ئابووری لە فیدراڵیەتێکی پیشەسازی ـ کشتوکاڵی جێبەجێ نەکرێ، هیچی دەست ناکەوێ، تەنها دواکەوتن و بێ هیوا بوونی نەبێ.

بیرۆکەی فیدراڵی پیشەسازی ئەگەر لە خودی خۆیدا سەیری بکەین، بەو پێیەی کە تەواوکەر و بەرئەنجامێکە بۆ دروستبوونی یەکێتی "فیدراڵی" سیاسی، لە ڕێگای بنەما ئابوورییەکانەوە زۆرترین دڵنیایی چنگ دەکەوێ کە جێبەجێ کردنێکی باڵاو بەرزترین ئاستی بنەماکانی هاوکاری و دابەشکردنی کارو هاوسۆزی ئابوورییە"ل١١٣". دەتوانم هەموو بیروباوەرە ئابوورییەکانم کە لە



ماوەی بیست و پێنج ساڵدا کۆمکردۆتەوە، لەم سێ خاڵەدا کورت بکەمەوە: فیدرالییەکی کشتوکاڵی ـ پیشەسازی، بەڵام هەموو بیروڕا سیاسییەکانم دەتوانم بەم دارشتەیە گوزارشتی لێ بکەم فیدراڵییەکی "یەکێتی" سیاسی نامەرکەزی "واتە فیدرالییەکی پلەپلە" "التدریجی".

"یەکێتی"فیدراڵی" کشتوکاڵی پیشەسازی هەرگیز چارەسەرناکرێ، ئەگەر بەتەواوی دانەمەزرێ" بەتایبەت چەقبەستووە لەسەر پێدانی مافی موڵکایەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، لەیەك کاتدا بۆ کۆی کۆمەڵگا ئابوورییەکان و هەموو ناوچەکان بۆ هەموو کۆمەڵە کرێکاریەکان و هەموو کرێکارەکان و جووتیارەکان بەرەوشتی تاکییەکان، هەموو تاك و گرۆپەکان دەتوانن بەشی خۆیان بکرن، بەڵام کەس بۆی نییە کە داوای دابەشکردنی یەکێتی و یەکپارچەیی موڵکایەتی بکا کە هەموو بەیەکپارچەیی دەمێنێتەوە و بەش بەش ناکرێ.

لە راستیدا ئەو چەمکەی کەلە کتێبەکەی پێشووی پرۆدۆندا "تیۆرەی موڵکایەتی" ١٨٦٥و دواتر لە کتێبی "توانای سیاسی چینی کرێکار١٨٦٥" جەختمان لەسەر کرد، لە هەمانکاتدا مانا و ناوەڕۆکی "پێشەکییە" بەناوبانگەکەی پرۆدۆنمان بۆ روون دەکاتەوە هەروەها لە "رەچاوکردنە کۆتاییە هەڵبژاردەکان، بۆ چاپی سێیەمی "رابەری پێشبڕکێ لە بۆرسەدا" ١٨٥٧، بیریار، چارەسەری مەسەلەی دیموکراسی پیشەسازی و "کۆماری پیشەسازی" کرد.

بەپێی ئەوەی پرۆدۆن وتی، سێ روخساری دیموکراسی پیشەسازی دەدۆزینەوە: یەکەم هەڵوەشانەوەی ئەو دەسەڵاتە ستەماکارییەی کە پیاوە گەورەکان و دەوڵەت لە کارگە دامەزراوەکاندا بەکاری دەهێنن، دانانی چاودێرییەك و هەڵبژاردنی نوێنەرێك لە خودی کرێکاران خۆیان، کە دواتر پێیان دەگووت خۆ

بەرێوەبەری کرێکارانە "التسیر الذاتی العمالی، Autogestion Ouvriere" هەرچەند ئەم "کۆمارە پیشەسازیە" زیاتر دەرۆیی و لە ناو جەرگەی پەیوەندییە مولکایەتییەکە بلاودەبۆوە، بەو پێیەی کە هەموو کرێکارە بەشداربووەکانی مولکایەتی بگرێتەوە. دیموکراسی پیشەسازی یەکێتی مولکایەتی و هاریکاری ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی رێك دەخست بەو پێیەی مولکایەتی لە یەك کاتدا بۆ رێکخراوە ئابوورییەکان و ـ چ مەرکەزیبن یا هەرێمی ـ و بۆ هەموو لقە جیاوازەکانی پیشەسازی و هەموو کارگەیەك و تا ئاستێك بۆ کرێکاریش، دەگەڕایەوە ئەمەش باشترین رێگا بوو، بۆ گەیشتن بە پۆلینکردنێکی کۆتایی بۆ هەموو پاشماوەکانی سەرمایەداری.

لە پەرەگرافێکی پێشەکی ئەو کتێبەی کە باسمان کرد، پرۆدۆن جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە دیموکراسی پیشەسازی لە ئەنجامی دروستبوونیدا "سەرپەرشتی کار بەسەر کاردا مومارەسە دەکرێ" ئەو وای دەبینێ کە"سەرەڕای ئەو دیدگایەی کە لێیەوە تەماشای مەسەلەکان دەکرێ، بێگومان ئێمە بەئاراستەی دیموکراسی پیشەسازی دلنیا دەرۆین، بەلام وەك ئەوە وایە بگەرێینەوە بۆ دەرەبەگایەتی.... وەلێ کۆماری پیشەسازی بەم جۆرەیە:

ـ هاوسەنگی نێوان دەولەت و کۆمەلگایەکی ئابووری رێکخراو لەسەر بنەمای خۆ بەرێوەبەری کرێکاری .

ـ پێدانی ئەرکی دروست کردنی کۆمەلگایەکی دیموکراسی بەکرێکاران.

ـــ سەقامگیری پێکهاتەیەکی سیاسی کە هەموو جۆرەکانیدەسەلات رەتبکاتەوە.

ـ لە کۆتایی دیاریکردنی قەوارەی دەولەت بە هۆی مولکایەتی هاوبەشەکی و هاریکاری.



بەکورتی، دەبینین پرۆدۆن لێرەدا پێشبینی فرە کۆمەلییەکی نامەرکەزی کردووە، کە ئامانجی ئەوە بووە دوای شۆڕشی کۆمەلایەتی جێگای سەرمایەداری رێکخراو بگرێتەوە. ئەم کۆمەلییە بەئاراستەی خۆ بەرێوەبەری کرێکاری و سەقامگیر بوونی جۆرێك لە هاوسەنگی نێوان یەکێتی مولکایەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، لەژێر چاوەدێری دیموکراسی پیشەسازی کرێکارانەو نێوان دیموکراسییەکی سیاسی کار سنووردار، دەڕوا. پرۆدۆن لەکتێبی "تیۆری مولکایەتی"دا جەخت دەکاتە سەر نموونە بالاکەی خۆی کە بانگەشەی سەرهەلدانی دەولەتێکی نوێ و مولکایەتییەکی یەکگرتوو دەکا کە هەردوو جەمسەری کۆمەلگای دوا رۆژ و هەردوو دەستە بالاکە پێك دەهێنن، کە لە نێوان خۆیاندا هاوسەنگ دەبن لە هەمان ئەو کاتەی کە هەریەکە و پارێزگاری لە سەربەخۆی خۆی دەکا.

بۆ ئەوەی مولکایەتی سیۆسیالیستی پۆشتە و پەرداخ بێ دەبێ ئەرکە کۆمەلایەتییەکان بە شێوەیەکی یەکجارەکی ملکەچی یاسای ناوخۆیی بن کە پشت بەستووە بە ماف و دادپەروەری، بۆ ئەوەی ئەو مولکایەتییەی کە خۆی لە هەموو نەنگی و خەوشەکان پاك کردۆتەوە ببێتە مولکایەتییەکی یەکگرتوو.

واتە بریتییە لە "مولکایەتییەکی سۆسیالیستانەی بابەتی نێوان دەستی کۆمەلی". ئەو مولکایەتییەی کە ناوەڕۆکێکی سۆسیالیستی کردارەکی هەیە تەنها بە پێی بابەتەکانی، بەلکو خۆی سروشتی خۆی دەگۆڕێ. بە پشت بەستن بەمە پرۆدۆن هەستا بە دامەزراندنی یەکیەتییەکی پیشەسازی-کشتوکالی، ئەو یەکیەتییەی کە خۆی بەرێوە دەبا بەو پێیەی تۆپەلەیەکی "کتلة" یەکگرتووی پتەوەو شایانی هەلوەشانەوەی نییە و بارستێکە ناخزێ، نەك بەو پێیەی کە پەیوندییەکی پەیمانەکییە "تعاقدیة".

له راستییدا ئەم جۆرەی مولکایەتی هۆکارەکانی بەرهەم هێنان پێشتر یۆتۆپیا نەبووە، ئێمە دەتوانین تێبینی شەپۆلەکانی بکەین نەك تەنها لە کولخوزاتەکانی رووسیا یا لە زادرۆگاتەکانی یوگسلافیا، بەڵکو لەسەر چەند شێوازێکی زیاتر لە بواری جێبەجێکردنی پلانڕێژی کۆمەڵی نامەرکەزی و لە سەرهەڵدانی خۆ بەڕێوەبەری کرێکاریش ببینین، کە هەڵدەستێ بەچاودێریکردنی دامەزراوەکان و ئەرکەکانیان، وەکو پوختەکردنی خودی پلانڕێژی بەرهەم و ئەو ئامرازانەی کە پەیوەستن بە دابەشکردنی بەرهەمەوە.

لەبەر ئەوە پێویستە خۆمان لەو واقیعە نەدزینەوە کە یەکگرتن "الاتحادیة" بەرەو دوا گەڕایەوە، لەبری ئەوەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم سەرکەوێ، بەو شێوەیەی کە پرۆدۆن پێشبینی دەکرد. لە راستیدا کۆمەڵێك جوولانەوە هەبوون کە ئاڕاستەی پێچەوانەیان هەبوو، بەڵام لە بواری نەتەوەییدا دەبینین یەکگرتنی دەولەتە کۆنەکان وەك ئەمریکا و ئەڵمانیا و بەرازیل... هتد، وردە وردە لە شێوەی یەکگرتوویی نزیك دەبوونەوە. هەرچەند بنەمای یەکگرتوو یا بەلای کەمەوە یەکگرتووی فیدراڵی رێکخراوە نێو دەولەتییەکانی شپرزەکرد. لە بوارێك کە بواری بزووتنەوەی کرێکارییە دەبینین سەندیکاکان بە روونی شێوەیەکی فیدراڵی یەکگرتووییان وەرگرت.

ئەم ئاراستانە لە کاتی ئێستاماندا برەویان پێ درا و بە هێزبوون. تاکە هەڵاویێژەکان "أستثناءات" کە لەم بوارەدا سەرنج بدرێ گۆرەپانی پلانرێژی کۆمەڵییە زەبەلاحەکانی یەکیەتی سۆڤیەتە، هەروەك چۆن لە بواری ئەو پلانرێژیانەی لە پێناو تاك دروستبوون. سەرنجی ئەو دامەزراوە زەبەلاحانە دەدرێ کە مۆڵکایەتی تروستات و کارتلەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو. هەرچەند بارودۆخەکە لە وڵاتە کۆمەڵییەکان "الجماعیة" گۆڕاوە یا لە رێگای گۆڕانییەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، لەلایەك دەبینین یەکێتییە



فیدراڵییە سیاسییەکان رووبەڕووی سەربەخۆی رۆشنبیری خودەکی بوونە، کە بەشێوەیەکی روون سەرکەوتنەکانیان لە یەکێتی سۆڤیەت و یۆگسلاڤیا دیارە. لە لایەکی ترەوە دەبینین پلانڕێژە "پڕۆژە و پلان" کۆمەڵییەکان لە ژمارەیەك لە گەلە دیموکراسییەکان "الدیمقراطیات الشعبیة" لە رێگای نامەرکەزی هەرێمی لایانداوە، هەروەك لە رێگای خۆ بەڕێوەبەری کرێکارانەش لایانداوە. ئەم بارودۆخە بە شێوەیەکی گشتی لە یۆگسلاڤیا هاتەدی. بەڵام لە یەکێتی سۆڤیەت، ئەم بارودۆخە واتای گەڕانەوە بوو بۆ بنکەی شوورەوی "مجالس القاعدە" Soviets کە لە سەرەتای شۆڕشدا بە شێوەیەکی هەرەمەکی سەری هەڵدابوو، سەرنج دەدرێ لە هەرێمە جیاوازەکان ئاراستەکان بەرەو پلانڕێژی نامەرکەزی و " خۆ بەڕێوەبەری کرێکارانە" دەڕۆیشتن. لە ڕاستیدا ئێمە ناتوانین ئەو دوو بزاوتە بێ پەیوەست بوون پێکەوە بدۆزینەوە، هەرچەندە سەرکەوتنیان بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پرۆدۆن راستر بوو لەوەی کە ئێمە پێمان وابوو. سەرەڕای ئەوەی لە باسکردنی روخساری نموونەی بیرۆکەی یەکگرتن، لەگەڵ ئەوەشدا ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەکانی ئەم بیرۆکەیەی لە بیرکردووە.

د- بۆ کۆتایی هێنان بە خستنەڕووی تیۆرە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی پرۆدۆن، ماوە ئاماژە بەو ئامراز و هۆکارانە بدرێ کە وای لێکرد پەلە بکا لە سەرهەڵدانی شۆڕشی کۆمەڵایەتی و سەرکەوتنی یەکجارەکی. لەم بوارەدا باشترە بە شێوەیەکی سەرەکی بگەڕێینەوە بۆ کتێبەکەی کۆتایی: دەربارەی توانای سیاسی چینی کرێکار: لە راستیدا پرۆدۆن، ئەگەر لە کتێبەکەی پێشوودا داوای پۆلێنکردنی راستەوخۆی سیستەمی سەرمایەداری و چینی بورژوازی کرد بێ، ئەگەر وای سەرنج دابێ کە شۆڕشی کۆمەڵایەتی قابیلی سەرهەڵدانی نییە، تەنها لە رێگای توندوتیژی و راپەڕینەوە نەبێ ئەو شتەی کەوا لە پرۆلیتاریا دەکەن لە رێگای هێزەوە بگەن بە دەسەڵات. واتە پرۆدۆن

ئاماژەی بەو ڕێگا بەرجەستەکراوە داوە، کە لەسەر پرۆلیتاریایە بە دەستی بێنێ بۆ ئەوەی ئامادە بێ بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی کە پێی سپێردراوە. پرۆدۆن لە کتێبی "دانپیانانەکانی شۆڕش"دا خۆی دانی بەو مەسەلەیە ناوە کە دەڵێ: "بۆ ئەوەی بتوانین کارەکان جێبەجێ بکەین چ شتێکمان کەمە بۆ ئەوەی پیشتگیریمان لێ بکا؟ یەك شتە: بەکارهێنانی شۆڕش! .... بەکارهێنانی شۆڕش مەسەلەیەکە جارێکی تر بە پەرش و بڵاوی و بە شێوەیەکی هەمە جۆر یا لە ڕێگای گۆڕانکارییە ناچاوەڕوانکراوەکانەوە ڕوونادادتەوە، بەڵکو لە میانەی ئاسانکاری و تێپەڕاندنی و لادانەوە ڕوودەداتەوە" ل٤٠٣.

پێشتر ڕێکەوت نەبووە کە باس لە کتێبێکی پرۆدۆن بکەین بەناوی "بنەمای گشتی شۆڕش لە سەدەی نۆزدەهەم" دا یا "لێکۆڵینەوەی هەڵبژاردەکان دەربارەی مومارەسەی شۆڕش و پیشەسازی "یشی پێ دەڵێن. هەرچەند پرۆدۆن لەو کتێبەدا دوو سەرنجی خستۆتە ڕوو یەکەم دەڵێ: چ کرێکارەکان ئەمە بزانن یا نا، گرنگی کارەکەیان لە بەرژەوەندییە بچووکەکانیانەوە سەرچاوە ناگرێ "ل١٧٦، ئەم گرنگییە کە تەنها لە ڕێگای، هەڵوەشاندنەوەی کۆی سەرمایەداری"ەوە دێ. دووەم ئەوەیە کە "کۆمپانیا کرێکارییەکان چەکی حەقیقەتی شۆڕشن "ل٢٨٠، لەم کۆمپانیایایەدا پرۆدۆن باسی خانەکانی "خۆ بەڕێوەبەری کرێکاری" و هاریکاری بەرهەمهێنان و نوچ دانە "الارهاصات" سەندیکاکانی کردووە. ئەگەر ئێمە بەجیا سەیری ئەم دوو سەرنجە بکەین بەئاسانی بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە مەسەلەی "بەکارهێنانی شۆڕش "کە پرۆدۆن زۆری لەسەرقسەکردووە، مەسەلەیەکە زۆر زۆر پێویستی بە دیاریکردن و ورد بوونەوە هەیە. لەبەر ئەوەی پرۆدۆن مانگرتن و پلانگێڕانی بەلاوە دەخست ئەم بەلاوەخستنەش نەك لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا قەدەغە بوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی پرۆلیتاریایان بێ هێز و لاواز دەکرد لە ڕێگای تێکچوونی



کلۆلییەکانییەوە... ئەمەش سەبارەت بە قۆناغی چوونە سەرەوەی سەرمایەداری ڕاست بوو، بەڵام سەبارەت بە قۆناغەکانی تری سەرمایەداری هەرگیز نەدەگونجا، لێرەدا دەبینین پرۆدۆن جارێکی تر پێویستی بەرۆحی ڕێژەیی دەبێ "الروح النسبية".

جارێکی تر دەچێتەوە سەرکتێبی "توانای سیاسی لای چینی کرێکار "لەم کتێبەدا پرۆدۆن، داوا لە چینی کرێکار دەکا کە گرنگی بە خۆی بداو ئایدۆلۆژیایەکی تایبەت بە خۆیان دابڕێژن و هەستن بەکاری سیاسی پەتی، هەروەها داواشی دەکرد بۆ دەست گرتن بەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا، کاربکەن. بەڵام پرۆدۆن وای دەبینیی ـ لێرەدا لەگەڵ مارکس جیاوازن ـ کە دەست گرتن بەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا سەرکەوتوو نابێ، ئەگەر لە هەمانکاتدا دەست بەسەر دەسەڵاتی ئابووریشدا نەگیرێ، کە کرێکاران بە شێوەیەکی سەربەخۆ ڕێکی دەخەن.

چینی کرێکار "بورژوازییەتیساڵی ٨٩...ئامانجی ئەوەیە لە هیچەوە ببێ بە هەموو شتێ "ل٦٢. خاوەندارییەتی توانای سیاسی واتە پێبوونی هۆشیاری خودەکی یا هۆشیاری تاك بۆ خۆی وەك ئەندامێکی کۆمەڵ، هەروەها واتا جەختکردنە سەر ئەو بیرۆکەیەی، کە لە ئەنجامی ئەوەوە دێ و پەیڕەوکاری جێبەجێ کردنەکەیەتی" ل٩٠. هەرچەند چینی کرێکار هۆشیاری خودەکی لەلا دروستبوو" بە شێوەیەکی تایبەت لە ساڵی ١٨٤٨، ئەو ڕۆژە بووە خاوەنی" بیرۆکەیەك کە دەگونجا لەگەڵ ئەو هۆشیارییەی کە بۆ خۆی کۆی کردبۆوە، ئەو بیرۆکەیەش لە ناکۆکییەکی تەواو دایە، لەگەڵ بیرۆکەی بورژوازییەت، دەتوانین بڵێین ئەم بیرۆکەیە تەنها بە شێوەیەکی ناسەرتاپاگیر "غیرمتکامل" بەرامبەر چینی کرێکار ئاشکرا دەبێ، چینی کرێکار جارێکی تر لە هەموو پەیڕەوکارییەکانی ئەم بیرۆکەش پەیڕەوی ناکا، "ل٩١". تەنها ئەو شتەی کە

نییەتی، مومارەسەکردنێکی گشتگیری هاوتایە لەگەڵ سیاسەتێکی داهێنەرانە بە خۆی و ئەو دەنگدانەی بە قازانجی پارتەکانی تر، دای شایەدی ئەمەن، هەروەها شایەدی ئەو حوکمە سیاسییە جۆراوجۆرانەن کە سەرپەرشتی دەکا "ل٩٢".

لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵگای هاوچەرخ دابەشی سەردوو چین بووە، یەکەم کرێکارو کرێ گرتەکانە، دووەم چینی سەرمایەدار و موڵکدار و بەڵێندەرەکانە، مەسەلەکە زۆر روونە، ئەنجامی ئەمە بریتییە لە مومارەسەی جیابوونەوەی نێوانیان، ل٩٦. لەگەڵ ئەوەی بورژوا لە کاتی جیابوونەوەی لەگەڵ پرۆلیتاریا، لەسەر مافی پرۆلیتاریا بەشی خۆی دەبا، لێرەدا پرۆدۆن دەپرسێ ئەی بۆچی پرۆلیتاریا لە کاتی جیا بوونەوەی لەگەڵ بورژوا مافی نییە؟ بۆیە پێویستە پرۆلیتاریا بەوریاییەوە لە بورژوازییەت جیا ببێتەوە و جیهانێکی سەربەخۆ بە ئایدیۆلۆژیای تایبەت و رێکخستنی ئابووری تایبەت و رێکخستنی سیاسی تایبەتەوە بۆ خۆی دروست بکا. ئەم جیابوونەوە رەهایە پرۆدۆنی برد بەرەو ئەوەی داوای دابڕانی "المقاطعة" کۆی دامەزراوەکانی سیستەمی سەرمایەداری بکا، بەگروپی نوێنەرە سیاسیەکانیشەوە، هەتا ئەگەر ئەو گروپانە هەڵقوڵاوی جۆرێك لە دیموکراسی شێوەیش بێ. لاخەراوەیەکی "أستثناء" تایبەت لەم بوارەدا، شارەوانییە ناوخۆیەکانە" البلديات المحلية" کە تاکە شتێکە لە کاتی گونجاودا شۆڕشی کۆمەڵایەتی پشتی پێ ببەستێ" بۆ ئەوەی کاتێ شۆڕشەکان جێبەجێ بوون، شارەوانییەکان بتوانن لە دیاریکردنی سنووری دەوڵەت بەشداری بکەن، کە بە شێوەیەکی هەمووەکی دەگۆڕی" ل٢٨١-٢٩٣.

جیابوونەوەی پرۆلیتاریا، دەتوانێ گوزارشتی لێ بکا لە رێگای ئەو ئەرکەی لە نێو کارەکانی تر، لە برەوپێدانی "مافی ئابووری لە رێگای دیاریکردن و سنووردارکردنی مافی سیاسییەوە" پێی هەڵساوە، "ئەوەی ئەم مافە ئابوورییە جیادەکاتەوە لە خودی خۆیدا مافێکی توند و توانایەکی بەرزی کۆمەڵایەتیشی



هەیە"ل١٨١". مافە کۆنەکان لەبەر ئەوە سلبی بوون، چونکە زیاتر کاریان قەدەغەکردن بوو لە بڕی ئەوەی رێگەپێدانی بێ". بەڵام مافی نوێ کە چینی پرۆلیتاریا دایهێناوە بە شێوەیەکی جەوهەری ئیجابییە" ئامانجەکەشی زیادکردنی مافە کۆنەکانە بە رێگەپێدانی، ئەمەش زۆر بە توندی و جەختکرنەوە"ل٢٢١" بورژوازت کە ئاژاوەگێری مێرکانتلایەتی کۆی کردۆتەوە و لە رێگای دەرەبەگایەتی و پیشەسازیشەوە کۆنترۆڵی کردووە، تەواو مافی ئابووری پرۆلیتاریای فەرامۆش کردووە، ئەو مافەی کە پێشتر -بە یۆتۆپیا- بیرۆکەی خەیاڵی "دادەنرا" ل٢٢٨-٢٢٩. ئەمەش تەنها یەکێکە لە هۆیەکانی لاوازبوونی. جیابوونەوەی نێوان چینی پرۆلیتاریا و چینی بورژوازییەت و دروستکردنی هەرەمەکیانەی دامەزراوەکانی تایبەت بە پرۆلیتاریا و مافی تایبەت، ئاماژەن بۆ نزیکبوونەوەی کۆتایی سەرمایەداری" ل٢٤٢.

ئەو دامەزراوە تایبەتیانەی کە داوای دەست گرتن بە چارەنووسی پرۆلیتاریا دەکەن و تایبەتن بە خۆی، لە لایەك "کۆمپانیا کرێکارییەکانە" لە لایەکی تر "پارتی سیاسی پرۆلیتاریایە". ئەو کۆمپانیا کرێکاریانەی کە پرۆدۆن گرنگییەکی زۆری پێدەدا پێویستە لە چوارچێوەی سێ ئاراستەدا درکی پێ بکەین: یەکەم: خانەکانی بەڕێوەبەری خودی کرێکاری کە دورستبوونی لە رێگای سیرورەتی "بەردەوامی" تێکۆشان لە کارگەکاندا تەواو دەبێ، ئەو تێکۆشانەش هەرەوەزی بەرهەمهێنانە کە وێنەی پێشینەیی یەکێتی پیشەسازی و کشتوکاڵی دیاری دەکا[1]. بەم

---

[1] لە کتێبی "رەچاوکردنە کۆتاییەکان" کە پاشکۆی چاپی سێیەمی "بەڵگەی کێ بڕکێ لە بۆرسەدا "١٨٥٧" ە، پرۆدۆن بڕوای وایە کە وزەی شۆڕشی کرێکاری دەتوانێ کۆمپانیا سەرمایەدارەکان بگۆڕی بە کۆمپانیای کرێکاری "سەقامگیربوونی ئەو کۆمپانیا بێ هەژمارانە کە ئامانجیان ملکەچکردن و سەر شۆرکردنی مرۆڤایەتی کرێکارە بۆ هەتا هەتایە، لە شیکردنەوەی کۆتایدا تەنها قۆناغێکی گواستنەوەکییە، کەواتە پێویستە لە

شێوەیە دەبینین کە پرۆدۆن چۆن ئێستای بە دوا ڕۆژەوە گەیاندووە، ئەمەش لەبەر بەرژەوەندی چاکسازی نەبووە، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی بووە. بۆیە ڕێکەوت نەبوو کە کۆمۆنەکەی پاریسی ساڵی ١٨٧١ و لقی فەڕەنسی لە نەتەوەیی یەکەم و سەندیکای شۆڕشگێڕی بەرەو هێڵی پرۆدۆنی دەڕۆیشتن، هەرچەندە ئەم شتە ڕێگری لە سەندیکاکان نەدەکرت، لە هەموو هەوڵێکی نزیکبوونەوەی نێوان خانەکانی تێکۆشان لە کارگە و سەندیکاکان لە لایەك و نێوان هەرەوەزی بەرهەمهێنان لە لایەکی ترەوە ڕەتبکاتەوە، هەروەها ڕێگریشی لێ نەدەکرد کە داوای مانگرتن بکا بەو پێیەی ئامرازێکی ستراتیژی کارایە.

رق لێبوونەوەی پرۆدۆن لە چینی بورژوا گەیشتە ئاستێك کە هێزی حەقیقی ئەم چینە فەرامۆش بکا. بۆیە دەڵێ: "دەبینین ڕۆژێك دێ کە کرێکارە ڕەش و رووتەکان یەکدەگرن و سەردەکەون و هەست بە خۆیان دەکەن و دەبنە خاوەن ئیرادەیەکی تایبەت بە خۆیان، هەروەها زیاتر و زیاتر پەرە بە بیروباوەڕەکانیان دەدەن"، بەڵام ئەو چینەی کە دەکەوێتە ژێر دەست و پێوە، دەبنە خەڵکی هەرچی و پەرچی چینی بورژوازیەت...بەم زووانە دەبینین کە بورژوازییەتی باڵا دەکەوێتە نێوان کارەساتە سیاسییەکانەوە، هەروەها دەبینین ئەم چینە دەگاتە ئاخر قۆناغ لە قۆناغەکانی برسییەتی ئەخلاقی و سیاسی، دەبن بە کۆمەڵێك کە هیچ ئینسانییەتیان تێدا نییە بە تەنها خۆپەرستی نەبێ" ل٢٣١. لە پەرەگرافێکی تر دەڵێ: "جارێکی تر بورژوازییەت باس لە خۆی ناکا، ئەو ڕۆژە

---

کرێکارەوە هەموو چەوساندنەوەیەکی مرۆڤ بۆ مرۆڤ لەناو ببرێت و هەروەها لە ڕێگای ئەمەوە پێویستە هەموو چینەکانی لەیەك چیندا بتوێنرێنەوە، کە هەموو بەرهەمهێنەکان بگرێتەوە" ل٤٨٩.



بێ ئامانج دەبێ هیچ ڕۆڵێکی مێژوویی نابێ، جارێکی تر بیروباوەڕ و ئیرادەی نابێ... لە نێوان شۆڕشگێڕی و پارێزگاری، کۆماری و شەرعییەت دێ و دەچێ... بەبێ ئەوەی هیچ سیستەمێ دانی پیابنێ (اعتراف) و هیچ حکوومەتێك ڕیزی لێبنێ، ئەم چینە هیچ ئومێدێکی بە دەسەڵات نییە تەنها دەستکەوتنی قازانج نەبێ، هیچ شتێك وای لێناکا دەست بە دەسەڵاتەوە بگرێ تەنها ترس لە نادیاری نەبێ. چیدی بورژوازییەت چینێك نییە لە ڕێگای کار و بلیمەتییەوە، چینێکی زۆر و بە توانابێ، هەروەها چیدی بورژوازییەت چینێکی نییە داوا بکا و بیربکاتەوە و بەرەو پێش بچێ، لەو ڕۆژانەدا وەکو کەمایەتییەك مومارەسەی تیرۆر و مانگرتنی عەقاری و گێرەشێوینی لە بۆرسەدا دەکات" ل١٠٠.

لە کۆتاییدا پرۆدۆن دەگاتە ئەوەی کە: "بورژوازییەت بزانن یا نا، بادڵنیابن کە ڕۆڵەکەیان کۆتایی هات، ئیتر پەکی کەوت کە لەسەر پێیەکانی خۆی بڕوا، ئیتر ناتوانێ جارێکی تر لە دایك ببێتەوە" ل١٠١. ئەم بەرئەنجامە دەتوانێ تووشی سەرسوڕمانمان بکا، چونکە بەلای کەمیشەوە ئەگەر رووکەشیش بێ، بە ئاراستەی پێچەوانەی واقیعەوە دەڕوا: ئێستا بورژوازییەت لە بارودۆخێکدایە کە بە هۆی توانا و هێزی خۆی و ئەو ڕۆڵە یەك لایکەرەوەیەی کە لەم چەرخەدا گێڕای زیاتر ئاگادار بۆتەوە، کە پێشتریش بەم جۆرە نەبووە، ئەم چەرخە سەردەمی هاتنی سەرمایەداری ڕێکخراوە، کە ئیمپراتۆر لویس بوناپرت بزوێنەرێتی، وەکو چۆن چینی بورژوازییەت سەرکەوتنێکی گەورەی تێدا بەدەستهێناوە. پرۆدۆن ئەوەی بە باشی دەزانی، بە تایبەت لە کتێبەکانی دوایدا زۆر جەختی لەسەر "توانای دەرەبەگایەتی پیشەسازی و دارایی و میرکانتلایەتی" دەکرد". ئەوەش لەم لاپەڕانە٢٣٤-٣٩٩. جارێکی تر چاوی بەو بەربەست و تەنگ و چەڵەمانەدا خشاندەوە کە لەسەر پرۆلیتاریا پێویست

بوو بیکشێنێتەوە. بۆیە پێویستە چینی کرێکار بکەوێتە جەنگێکی سەختەوە، چونکە دوژمنی سەرەکی کارگە (سەرمایەداری، گەورەکان) و بانك و کۆمپانیا زەبەلاحەکان و بەرژەوەندییە باڵاکان و باجگرەکان و کشتۆکاڵ و موڵکایەتی گەورەیە، واتە هەموو ئەو هێزانەی کە دەتوانن بەم دارشتە کورتی بکەنەوە: دەرەبەگایەتی سەرمایەداری. پیشەسازی —مێرکانتلایەتی و موڵکایەتی ئازاد" ل٣٦٣-٣٦٥. هەروەها پرۆدۆن دەڵێ: "هاوپەیمانییەك لە نێوان گەورە موڵکدارەکان و گەورە سەرمایەدارەکان و گەورە پیشەسازەکان و گەورە فەرمانبەرەکان و گەورە چەوسێنەر و بەڵێندەرەکان و خاوەن کەشتی و خاوەن پشکەکان لە ئەوروپا و لە هەموو گۆی زەوی دروست بووە" ل٣٦٨. ئێمە پێشووتر بینیمان تروستات و کارتلە جیهانییەکانیش سەریان هەڵدا، پرۆدۆن زۆر بە واقیعی ئاماژە بەو هێزە راپەڕیوەی دژی پرۆلیتاریای شۆڕشگێڕ دەکا. لە پەراگرافێکی کتێبی "بەڵگەی کێ بڕکێ لە بۆرسەدا" دەگاتە ئەوەی کە پێی وایە "هەموو ئەو کارگە زۆرانەی سەرمایەداری، لە رێگادان بەرەو بە کۆیلەکردنی ئینسانییەتی کرێکار بۆ هەمیشە" ل٤٢٩.

بەڵام چۆن پرۆدۆن، لە ژێر ئەو بارودۆخەدا توانیویەتی پێشبینی نەیارێکی ترسێنەر لەسەر ئەو شێوەیە بکا، بەو پێیەی کە "گێرەشێوێنە" کە بێگومان دەمرێ؟. لە لایەك ئاشکرایە کە مەسەلەکە تێکەڵییەکە لە نێوان ئەحکامە بەهایی و ئەحکامە واقیعییەکان. لە لایەکی ترەوە پرۆدۆن بڕوای بەوە هەیە کە ئازادی کۆمەڵی داهێنەرانە بە پاڵپشتی وزەی شۆڕش دەتوانێ ترسناکترین کۆسپ تێپەڕێنێ، ئەوەش لە رێگای گۆڕینی کارگە سەرمایەدارەکان بۆ کارگەی کرێکاری. لێرەدا دەبینین پرۆدۆن تا کۆتایی تەمەنی شۆڕشگێڕبووە. یا مرۆڤایەتی بۆگەن و بێتام دەبێ، یا شۆڕشی کۆمەڵایەتی بەرزترین کات



سەردەکەوێ و موعجیزەی حەقیقەتی روودەدا. هەر رێکەوتنێکیش لە نێوان ئەم مەسەلەیە نەشیاو و نەگونجاوە.

لە کۆتاییدا بۆمان دەردەکەوێ کە پرۆدۆن زۆر لە کارل مارکس شۆڕشگێڕتربووە. مارکس لە رووبەڕووبوونەوەی هەڵوێست و بارودۆخە بەرجەستەکان میانڕەو بووە، بەڵام پرۆدۆن و قوتابییە حەقیقییەکانی هەمیشە لە بەرامبەر هەڵوێستەکان زۆر توندبوون. بەم شێوەیە دەبینین مارکس و لێژنەی مەرکەزی "الاممیە" پێش مانگێك لە سەرهەڵدانی کۆمۆنەکە، کرێکارانی فڕەنسایان "لە درەنگ سەرهەڵدانی راپەڕینە ناکامڵەکە" ئاگادارکردەوە، بۆیە مارکس لە پاریس پێشوازی لە کۆمۆنەکەی نەکرا، تەنها دوای بەرپابوونی نەبێ، ئەو لە کاتێکدا رازی بوونی خۆی لەسەر مەسەلەکە پێشاندا، کە زۆربەی زۆری پێکهاتەی کۆمۆنەکەی پرۆدۆنی بوون. لە راستیدا هەموو لێپرسینەوە ئیداری و ئابووری و سیاسییەکان کە کۆمۆنەکەی مارکس جێبەجێیکرد بوو هەمووی لە سروشتی پرۆدۆنەوە وەرگرتبوو، گەورەترین بەڵگەش بۆ ئەمە ناوی "یەکگرتووەکان" Feders. کە لایەنگرانی کۆمۆنەکەی ئەو کات بۆ خۆیان هەڵیانبژاردبوو.

دوای چەند ساڵێك لە هەرەسهێنانی کۆمۆنەکە، سەرەتا مارکس دواتر ئینگلیز هەستان بە بەڵگە هێنانەوە بۆ ئەوەی کە ئەم هەرەسهێنانە مانای زەنگی کۆتایی پرۆدۆنیە، دانیان بەکاریگەری خراپی پرۆدۆن دادەنا لەسەر کۆمۆنەکە.

هەرچەند پێشبینیەکانیان سەبارەت بەرەو لە ناوچوونی پرۆدۆنییەت راست نەبوو، ئەوەش لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی پرۆدۆن جارێکی تر لەسەر دەستی بزووتنەوەی کرێکاری دوای ساڵی ١٨٨٠ دەرکەوتەوە، بەتایبەت لەکاتی گەشەسەندنی سەندیکا و سەندیکای شۆڕش.

بزووتنەوەی کرێکاری دوای لە ناوچوونی کۆمۆنەکە، دووبارە بە پەلە خۆی دروستکردەوە، لەگەڵ پارتی کرێکاری کە پۆل لاڤارگ و جۆل گەیسدی مارکسی رابەرایەتیان دەکردو پارتی سۆسیالیستی شۆڕشگێر کە ئاراستەیەکی پلانکی هەبوو، ڤایان و ئالمان سەرکردایەتیان دەکرد، پرۆس پارتێکی دروستکرد بە ناوی پارتی کرێکاری ئیمکانی ئەم پارتە لەسەر جۆرێك لە پرۆدۆنی میانڕەو بوونیات نرابوو. پرۆس یەکەم کەس بوو کە پێشنیاری جۆرێك لە هاوسۆزی نێوان تێگەیشتنەکانی پرۆدۆن و تێگەیشتنەکانی مارکسی دەکرد. دەتوانین نموونەی ئەم هاوسۆزیە لە چوارچێوەی سەربەخۆیی دەزگا گشتییەکانی نامەرکەزی بدۆزینەوە، کە بە هۆیەوە دەتوانین ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی بکرێتە موڵکی دەوڵەتی پرۆلیتاری، کە بەرێوەبردنی لەسەر دەستی چاودێران خۆیانن. هەرچەندە پرۆس هەرگیز لەم بیروباوەڕانە قووڵ نەبووبۆوە، بەڵکو لە رێگای هەڵەشەیی خۆیەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە زهنییەتی پرۆدۆنەوە نەبوو، گەندەڵی کرد.

ئەگەر ئێمە، بمانەوێت بە دوای کاریگەری پرۆدنیدا بگەڕێین، پێویستە بە ئاراستەی بزووتنەوەی سەندیکایی بڕۆین. کە یاسایی ١٨٨٤- بە دەسپێشخەری حکوومەتەکەی فالدیك –رۆسۆ- دانی بە شەرعییەتی سەندیکاکان نا، لە ساڵی ١٨٩٥ یەکێتی گشتی کار دامەزرا CGT. لە هەمانکاتدا یەکێتی بورساتی کار، کە بە پاڵپشتی بیلوتییە لە ساڵی ١٨٩٣ دامەزرا و پێشکەوتنێکی خێرای بەخۆیەوە بینی. ئەم دوو رێکخراوە کە هەردووکیان لە ژێر کاریگەری پرۆدۆنییەت دابوون، ماوەی دە ساڵ لە ناکۆکییەکی درێژدا بوون. ئەگەر یەکێتی بۆرسەی کار ئیلهامی لە شۆڕشگێری پرۆدۆنی تێکەڵ لەگەڵ بەشێك لە کاریگەری باکۆنین وەرگرتبێ (لێرەدا چەمکی "ئاژاوەگێڕی-سەندیکایی") کەواتە CGT سەرەتا رووەو ئاراستەی پرۆدۆنی



میانڕەو رۆیشت، بەڵام یەکگرتنی ئەم دوو رێکخراوە لە کۆنگرەی مونبیلییە تەواوبوو کە لە ساڵی ١٩٠٢ بەسترا.

دەرکەوتنی سەندیکای شۆڕشگێری Syndicalism، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٢، کە بۆ ماوەی ١٢ دوازدە ساڵ کۆنترۆڵی CGT کرد، کاتێك لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانی ساڵی ١٩١٢ گەڕایەوە و خۆی پەڕاندەوە بەڵام دوای ئەوەی چەند کاریگەرییەکی خراپی لەسەر جێهێشت، چ لە فەڕەنسا یا دەرەوەی فەڕەنسا. سەندیکای شۆڕشگێری لە یەك کاتدا بزووتنەوەیەکی کرێکاری حەقیقی بوو کە بە شێوەیەکی پەشێوی لە فڕەنسا دەرکەوت و تیۆرەکە بۆ خۆی جۆرێك لە خوێیەتی دروستکرد، هەروەها بە شێوەیەکی بەشەکی لە ناوەڕۆکی خۆیدا جۆرێکە لە چاکسازی پرۆدۆنی چەپڕەوی خۆ گونجێنەر بە پێی بارودۆخەکان.

سەندیکای شۆڕشگێری لە کۆنگرەی. "ئەمیانی" ساڵی ١٩٠٦ بەڵگەنامەیەکی بۆ خۆی دانا، ئەو بەڵگەنامەیە هەر جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ دەوڵەت و بورژوازییەت رەتدەکردەوە، هەتا ئەگەر لەگەڵ پارتە سیاسییەکانیش بوایە. بەڵگەنامەکە "المیثاق" بانگەشەی کاری راستەوخۆ و مانگرتنی سەرتاسەری و شۆڕشی بەردەوام لە کارگە و وڵاتەکانی دەکرد، کە بە ٣٨ دەنگ بەرامبەر بە ٨ دەنگ بردییەوە، بەڵام دانەری ئەم بەڵگەنامەیە گریفوهلس Griffuhles بوو کە سکرتێری گشتی یەکێتی گشتی کاربوو CGT، یەکێك بوو لە گەورە رابەرانی سەندیکای شۆڕشگێری، بەو پێیەی بزووتنەوەیەکی حەقیقەتی بوو. لە راستیدا سەرکردایەتی سەندیکای شۆڕشگێری هەندێ بیروبارەوڕی لە پرۆدۆن وەرگرتبوو، وەك ئەوەی کە "کارگە دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی حکوومەت"، هیچ کەس ناتوانێ دیموکراسی پیشەسازی بوونیات بنێ تەنها کرێکارەکان خۆیان نەبن، ئەم دیموکراسییەتەش بۆ ئەوەی کاروبارەکانی خۆی جێبەجێ بکا

پێویستی بە کاری ڕاستەوخۆ "بوو، ئەم چەمکە ڕابەرانی سەندیکای شۆڕشگێری دایانهێنا، کە درێژکراوەی ستراتیژی پرۆدۆنییەت بوو، بە بێ ئەوەی سوود لە دیالێکتیکی پرۆدۆن وەربگرن". "کاری ڕاستەوخۆ پێویستە لە ڕێگای سەندیکا و خانەکانی لە کارگەکان تەواوبکرێ، بە چاوپۆشی لەهەر شێوەیەکی شەرعی... ئەمە مەسەلەیەك بوو کە پرۆدۆن لەگەڵیدا کۆك بوو، پشتگیریشی دەکرد. هەرچەند پرۆدۆن ئاماژەی بەوە دابوو، کە پرۆلیتاریا لە ڕێگای شۆڕشی کۆمەڵایەتییەوە دەتوانن دەست بەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا بگرن، ئەمەش مەسەلەیەك بوو کە سەندیکالیزمەکان لە نێوان ئەمە و "شۆڕشی بەردەوام" کە بانگەشەیان بۆ دەکرد تێکەڵیەکیان دروستکرد. بەڵام سەندیکالیزمەکان لە پرۆدۆن واقیعی تر بوون، ئەمەش بەوەی کە مانگرتنەکان بەشەکی بن یا هەمووەکی، شتێکی سەرەکین لە کاری ڕاستەوخۆدا.

ئەوەی سۆرێل لە کتێبی "تێڕوانینەکان دەربارەی توندوتیژی" ١٩٠٨ و وپرت لە کتێبی "خراپیەکانی ڕۆشنبیر" ١٩١٤، خستیانە سەر تیۆرەی سەندیکای شۆڕشگێری، پێش هەر شتێکی تر بیروباوەڕێکی ئەفسانەیی بوو، کە داوای کار دەکا بە هاوسۆزییەك لە نێوان بیروباوەڕەکانی پرۆدۆن لە لایەك و بیروباوەڕەکانی پرکسۆن لە لایەکی ترەوە. لە ڕاستیدا بیرۆکەی ئەفسانە "أسطورە" دواتر کاریگەری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر "لینین". دەبینین سەندیکای شۆڕشگێری بۆ کۆتایی هێنان بەو تێڕوانینانە، گرنگییەکی زۆری لە مەسەلەی ڕێکخستنی چینی کرێکاردا هەبوو، کەمتر لەو گرنگییەی کە پرۆدۆن بە مەسەلەکەی دابوو. ئەم گرنگییەش، بەو ژمارە کەمەی فەرمانبەرانی یەکێتی گشتی کاری پێ پێوانە نەدەکرا، "تەنها ٥٪ لە ڕۆڵەکانی جەماوەری کرێکار" بەڵکو بە ژمارەی بەژداربووانی مانگرتنەکان پێوانە دەکرا.



ئەم ژمارەیەش بەرزبوو، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٠٦ "٩٥٠٠,٠٠٠" بوو، لە ساڵی ١٩١٠ "٤٨٠٠,٠٠٠" بوو.

لەو کاتەی کە سەندیکای شۆڕشگێری بە شێوەیەکی فراوان لە فەڕەنسا پێشکەوت، جان جۆریس، سەرەڕای تێکۆشانی دژی لایەنگرانی "گەیسد"، تاکە سەرۆکی پارتی سۆسیالیستی یەکگرتوو بوو "١٩٠٥-١٩١٤". جۆریس، لە هەمانکاتیشدا بانگەشەی پشتگیری نەکردنی "کاری ڕاستەوخۆی" دەکرد،کە سەندیکای شورشگێری بانگەشەیان بۆ دەکرد، جۆریس دانی بە ڕاستی بیروباوەڕی سەربەخۆیی بزووتنەوەی سەندیکایی بەرامبەر پارتە سیاسییەکان نا، هەروەها دانی بەو ڕۆڵەش نا کە سەندیکا و خانەکانی، نەك تەنها لە چوارچێوەی سیستەمی سەرمایەداری بەڵکو، بەو ڕۆڵەش کە لە بنکەی بەڕێوەبەری پیشەسازی لە کۆمەڵگای دوا ڕۆژدا گێرای.

جۆریس، ڕەنگە لە ژێر کاریگەری بیروباوەڕەکانی سۆسیالیستی بەلجیکی "کایزار دی بایب" بووبێ، کە تەواو لە بیروباوەڕەکانیدا قووڵ بووبۆوە، بەڵام دووبارە گەڕایەوە سەر پرۆدۆن، بە تایبەت بۆ سەر ئەو یادەوەریانەی کۆتایی، کە پەیوەست بوون بە مەسەلەی موڵکایەتی. هەوڵیدا بە دروستکردنی هاوسۆزییەك لە نێوان بیروباوەڕەکانی مارکس و پرۆدۆن، کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد، خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی دەبێ لە ژێر دەستی دەوڵەتی کۆمەڵیدا، بێ بە مەرجێ موڵکایەتی کردارەکی ئەم ئامرازانە بدرێ بە کرێکاران، کە خۆیان بەڕێوەدەبەن. بەم شێوەیە جۆریس ئاشکرایی کرد کە ئەو لایەنگری کۆمەڵی نامەرکەزی دەبێ، کە پشتگیری خۆبە بەڕێوەبەری کرێکاری دەکا، بەڵام بەبێ ئەوەی بەناوی خۆیەوە باس لەو چەمك و گوزارشتە بکا، ئەمە وامان لێ دەکا لەو شتە تێبگەین کە "لیون جەوهەر" داوای دەکرد، کە ئەو کات سکرتێری گشتی یەکێتی گشتی کار بوو، زۆر ستایشی جۆریسی کرد،

کە بووە قوربانی پلانگێرییەکی نامەردانەی ئێوارەیەکی جەنگی سالّی ١٩١٤. وتی سەندیکای شۆڕشگێری لە جۆریس دوور نییە، تەنها بە ئامرازەکان نەبێ، واز لە ئامانجەکانی جۆریس ناهێنێ.

دەتوانین هەمان ڕێگوزەری هێڵی تیۆری لە بریتانیا، ببینین: کە بە سیدنی و بیاتریس و یب, تیۆرەوانی کرێکاری Travaillisme دەست پێدەکا، لە سەرەتای سەدەی بیستەم، بە "ج. د. ه کولی" کۆچکردوو تێدەپەڕێ کە یەکێك بوو لە گەورە سروشبەخشانی تیۆرەی سۆسیالیستی Gvild Socialism لە سالآنی ١٩١٨-١٩٢٥ و برەوێکی باشی هەبوو، دەگەیشت بە "هارۆڵد لاسکی"، کە یەکێك بوو لە بە ناوبانگترین نوێنەرانی "کۆمەڵناسی سیاسی" لە ١٩٥٠ کۆچی دوایی کرد. هەروەها یەکێك بوو لە بە ناوبانگترین ڕابەرانی ڕێبازی کرێکاری.

هەرچەندە "تۆڵەی پرۆدۆن" (*) بەوەندە وازناهێنێ، ئەگەر بکرێ هەوڵ دەدەین هەندێ روخساری پرۆدۆن، کە لە رووسیا ناسراوبوو، بخەینەڕوو لە چوارچێوەی پارتی سۆسیالیستی شۆڕشگێری، کە بە تایبەت ئاڕاستەی جووتیاران کرابوو.

---

(*) "تۆڵەی پرۆدۆن" لە کتێبی "پرۆدۆن و چەرخەکان" بەکارهێنراوە، کە کۆمەڵێك نووسەری پەیڕەوکارانی پرۆدۆنی میانڕەو لە سالّی ١٩٢٠ نووسیویانە. لەم کتێبەدا نووسەرەکان جەختیان کردۆتە سەر ئەو هەولّە جێگیرەی کە لە بریتانیا و ئەلمانیا لە پێناو پێدانی سیفەتێکی شەرعیانە بە مەسەلەی نوێنەرایەتی کرێکاران لە کارگەکاندا، درا. ئەم هەولّە لە سوید و نەرویژ و فڕەنساش دراو بەختێکی باشی سەرکەوتنیشی هەبوو. هەرچەندە نووسەرەکان لە بیریان چووە کە مەسەلەکە پەیوەستە بە کاریگەری سوککراو و ڕیژەکراو، بۆ نموونە "کۆنگرەی بنکەی کرێکاران" کە لە یەکەم سەردەمی شۆڕشی رووسی دروستبوو، بە ئاسانیش دەتوانین لە بیروباوەڕەکانی پرۆدۆندا بیدۆزینەوە.



باڵی چەپی توندڕەوی ئەم پارتە، تەنها بە پشتگیری تەواوی شۆڕشی سۆڤیاتی وازی نەهێنا، بەڵکو بەشداری لە یەکەم حکوومەتی سۆڤیەتی کرد. هەروەك دەسەڵاتی هاوبەشی هەریەك لە سەندیکای شۆڕشگێری فڕەنسی و پرۆدۆنی، ڕۆڵێکی گەورەیان گێرا لە دروستکردنی ژمارەیەکی زۆر لە سۆڤیاتاتی "کۆنگرەی" بنکەیی لە کارگە و شەریکەکاندا، کە لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر "١٩١٧" هاتنە سەر دەسەڵات و بنەمای خۆ بەڕێوەبەری کرێکاریی هێنایە دی. لە ئەنجامی ئەمەدا دەبینین، هەندێ لە بیروباوەڕەکانی پرۆدۆن توانیان دزە بکەنە ناو بەرنامەی دووەمی حیزبی شیوعی، ئەو بەرنامەیەی کە لە ئازاری سالّی ١٩١٨ بڕیاری لەسەر درا. هەروەها توانی بچێتە ناو ئەو وتارانەی کە "لینین" دژی حکوومەتە گواستنەوەکییەکەی لیرینسکی سالّی ١٩١٧ پێشکەشی کرد. لە یەکێك لەو وتارانەدا "لینین" بە روونی ئاشکرای کرد کە "بەبێ خۆ بەڕێوەبەری کرێکاری لە بنکەدا، هیچ کۆمەڵی و پلانرێژییەك بوونی نییە" هەرچەند دوای ئەوە بە هۆی جەنگی ئەهلییەوە و ئەو هاوبەشییەی کە لینین و تروتسکی پێکەوە بوونیاتیان نا، سوڤیاتاتی بنکەیی هەڵوەشایەوە. هەروەها لە کۆنگرەی دەیەمی حیزبی شیوعی "ئایاری ١٩٢١" سەرکۆنەی بەرهەڵسی کرێکاران کرا کە "شلا بنیکۆڤ" ڕابەرایەتی دەکرد و داوای دووبارەکردنەوەی خۆ بەڕێوەبەری کرێکاریی دەکرد... ئەم ڕێبازە بە "ئاژاوەگێڕی لادەرانە-بورژوازی بچووك" پێناسەکرا، ئاشکرایە کە ئەمە بیروباوەڕی پرۆدۆنیش دەگرێتەوە.

مەسەلەکە وای پێویست دەکرد کە چاوەڕێی کۆنگرەی بیست و دووەمی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی ١٩٦١ بکرێ پێش ئەوەی جارێکی تر قسە لەسەر "بەڕێوەبەری خودی جەماوەری "بکرێ وپێش ئەوەی دەست بە فەرمانی ئاماژە یەکەمینەکان بکرێ، کە لە و پێشکەوتنەی بە ئاراستەی خۆ بەڕێوەبەری

کرێکاریی هاتبوو. بیروباوەڕی پرۆدۆن لە سەرهەڵدانی دیموکراسی پیشەسازی-کشتوکاڵی تا ئەمڕۆش نەهاتەدی، تەنها لە کولخوازاتی جووتیاری نەبێ، کە لە بواری ڕێکخستنی پیشەسازی لە یۆکسلاڤیا لە ساڵی ١٩٥٠ سەروکار ببوو... بێگومان لە ڕۆژئاوا، مەترسییەکی گەورە لە پشت بەرپابوونی تەکنوکراتییەت هەبوو، کە خۆی خستبووە خزمەت تراستات و کارتلە تایبەتی و نەتەوەیی و جیهانییەکانەوە، تەکنۆکراتییەت بوو کە سەرپەرشتی دامەزراوە زەبەلاحەکانی بەسەر دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتییەکانی دەستەبەر دەکرد. ئەو مەترسییە گەورەیەش وای لە مەسەلەی خۆ بەڕێوەبەری کرێکاری کرد ببێتە مەسەلەیەکی زیندوو. دوای سەدەیەک(*) لە مردنی پرۆدۆن، دەبینین بیروباوەڕەکانی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا خۆی سەپاند، بە بڕوای من، ئەمە گەورەترین ڕێزە، کە بتوانین لە یادی ئەم پیاوەدا پێشکەشی بکەین.

(*) ساڵی دەرچوونی کتێبەکە (و-ک).



## هەڵبژاردەیەك لە كتێبەكانی پرۆدۆن

### "نامەی پاڵاوتن بۆ بەدەستهێنانی زەماڵەی سوارد" **Suard** ١٨٣٣

"لەناو چینی کرێکاردا لە دایك بووم و گەورەبووم، تا ئێستا و بۆ هەمیشەش بە دڵ و بە زهن و داب و نەریتم، بە تایبەت لە ڕێگای بەرژەوەندی و دڵسۆزی هاوبەشمەوە خۆشم ئەوێن. بەڕێزان، خۆشحاڵم کە وەکو پاڵێوراوێك دەنگتان خستەپاڵم، هەروەها زۆر خۆشحاڵم بۆ هەڵبژاردنی دادپەروەرانەتان بۆ ئەو چینەی کۆمەڵگا کە چینی کرێکارە، جێگای ڕێزە بۆ من کە وەك یەکەم نوێنەری ئەم چینە بم بۆتان، هەروەك زۆر خۆشحاڵم کە بێ چاوپۆشی و لە ڕێگای فەلسەفە و زانست بە هەموو هێز و ئیرادە و وزە و تواناموە کار بکەم لە پێناو ڕزگارکردنی برا و هاوڕێکانم" ل ١٦ ژمارە ١٩.

### لە "بە پیرۆزکردنی ڕۆژی یەکشەمدا" ١٨٣٩.

"پێشتر مەسەلەی یەکسانیم لە بارودۆخ و سەروەت و ساماندا خستەڕوو، بەڵام وەکو تیۆرییەکی بێ بنەما: بۆیە پێویستە سەر لە نوێ بیخەمەوە ڕوو لە حەقیقەتەکەی قوڵبمەوە" ل٦٠.

«بەڵام لەو کاتەدا ڕووبەڕووی گرفتێکی نوێ بوومەوە، کە باوردۆخێکی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بوو، کە نە دەرەبەگایەتی و نە دیکتاتۆری و نە دابەشەکی و نەئاژاوەگێڕی بوو، بەڵکو لە ڕێکوپێکیدا لێوان لێو لە ئازادی و لە یەکێتیدابوو، پڕبوو لە سەربەخۆیی. بەڵام دەبێ خاڵی یەکەم چارەسەربکەین، بۆ ئەوەی خاڵی دووەم بمێنێتەوە: دیاریکردنی بەرزترین جۆری گواستنەوەکی، لێرەدا دژوارییەکانی مرۆڤایەتی بە گشتی دەردەکەوێ» "ل٦١".

## "مۆڵکایەتی چییە؟" ١٨٤٠

ئەگەر لێم بپرسن بە یەك وشە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە: "کۆیلایەتی چییە؟" دەڵێم کوشتنە، پەی بردن بەم وەڵامە ئاسانە، پێویست ناکات وتارێکی درێژ بدەم بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە توانای دامالّینی بیروباوەڕ و ئیرادە و کەسایەتی مرۆڤێك، هەمان توانای کۆنترۆڵکردنی ژیانی و مردنییەتی، بۆیە کۆیلەبوونی مرۆڤ واتای کشتنیەتی، بەلاّم ئەگەر بپرسن مولّکایەتی چییە؟ دەڵێم دزییە، کە ئەشزانم کەس گوێم لێناگرێ، هەرچەندە پرسیار و وەلاّمەکەی دووەم هیچ جیاوازییەکی لە پرسیار و وەلاّمەکەی یەکەم نییە، تەنها لە رووی رووکەشییەوە نەبێ "ل١٣١".

ئەمە پێمان دەڵێ، مولّکایەتی مافێکی مەدەنییە، لە ڕێگای داگیرکاری و دەست بەسەرداگرتنەوە دروست دەبێ، پشت بەستوون بە یاسا، هەروەها جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە مولّکایەتی مافێکی سروشتییە و رەگەکەشی لە کاردایە: سەرنج دەدرێ کە نموونەی ئەم تیۆرانە سەرەڕای دژکارییەکانیشی لە لای ئەو کەسانەوەیە کە هانی دەدەن و چەپڵەی بۆ لێدەدەن. بەلاّم من دەڵێم نەکار و نەداگیرکاری و نە یاسا ناتوانن مولّکایەتی دابهێنن. مولّکایەتی ئەنجامێکە هۆکاری نییە، ئایا بە هۆی ئەوەی کە وتم، شایانی سەرکۆنە کردنم.؟ ئاه چەند بێ دەنگە ئێستا بەرز دەبێتەوە!

- مولّکایەتی دزییە! ریسوابوونتان زەنگی ساڵی ٩٣ یە! کەنەفت بوونتان بوومەلەرزەیەکە، کە شۆڕشەکان بەرپای دەکەن! "ل١٣١-١٣٢".

بەڵێ، هەموو خەڵکی پێیان وایە کە یەکسانی بارودۆخەکان وەك یەکسانییە لە مافەکان، مولّکایەتی و دزی دوو چەمکی هاوواتان، هەموو بالاّییەکی کۆمەلاّیەتی واتای تالاّنکارییە لە بەهرە و خزمەتدا، ئەمەش تەنها ستەم و



دزێتییە: من دڵنیام هەموو مرۆڤێك ئەم حەقیقەتانەی لە دڵی خۆیدا هەڵگرتووە، بەلاّم مەسەلەکە لەسەر توانای دەرککردنیان وەستاوە "ل١٣٥".

دادپەروەری جەمسەرە سەنتەرە، کە فەرمانڕەوایی کۆمەڵگا دەکا، ئەو جەمسەرەیە کە جیهانی سیاسی بە دەوریدا خولگەی گرتووە، هەروەها بنەما و بنکەی هەموو کات و سەردەمەکانە. هیچ شتێك بە نێو مرۆڤەکاندا ناروا ئەگەر پشت بەستوو نەبێت بە یاسا، هیچ شتێك شیاوی روودان نییە بەبێ پەیوەست بوونی بە دادپەروەرییەوە. هەرچەند دادپەروەری دروستکراوی یاسا نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە یاسایەك، ئەگەر دادپەروەرێك بانگەشەی نەکاو جێبەجێی نەکا بە هیچ شێوەیەك یاسا نییە، ئەوەش لەو بارودۆخەی کە مرۆڤەکان لە پەیوەندییەکی نێوان خۆیاندا خۆیان دەبیننەوە. ئەو فکرەیەی کە سەبارەت بە دادپەروەر و یاسا خستمانەڕوو، ئەگەر بە شێوەیەکی هەڵە دیاریمان کرد و کەموکوڕیشی تێدابوو، ئەوە بێگومان هەموو جێبەجێکردنێکی یاسایمان خراپە و هەموو دامەزراوە و سیاسەتەکانمان هەڵە و گەندەڵن، لێرەشدا تەنها ئاژاوەگێری و شەڕی کۆمەلاّیەتی بە کەڵك دێ.

...کار دەتوانێ مولّکایەتی تێکبشکێنێ، ئەگەر سیستەمێکی دادپەروەری هەبێ ل٢٠٥.

دەڵێن سەرمایەداری نرخی رۆژانەی کرێکار دەدا، بۆ ئەوەی وردبین، پێویستە بڵێین سەرمایەداری نرخی ئەو رۆژانە دەدا کە کرێکارەکەی تێدا بەکارهێناوە، واتا بەگوێرەی ژمارەی رۆژەکانە، ئەم دوو قسەیەش بە دڵنیایەوە جیاوازن، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەو هێزە زۆرەی لە یەکگرتوویی و یەکێتی نێوان کرێکارەکان پاڵپشتی و هاوسەنگی هەوڵدانیان بەرهەم دێ، شتێکن سەرمایەداری نرخەکەی نەداوە. دوو سەد کرێکار هەستان بە بەرزکردنەوەی

هەورە بانێك بۆ سەر بنكەكەی، گریمان پیاوێك، بۆ ماوەی دوو سەد ڕۆژ، هەوڵبدا بەم كارە هەڵسێ ئایا دەتوانێ؟ مەسەلەكە هەمان شتە سەبارەت بە كرێكارەكان كە بۆ سەرمایەدارەكان كاردەكەن... هەربەم شێوەیە دەشتێك پێویستە كشتوكاڵی تێدا بكرێ، ماڵێكیشی پێویستە و كارگەیەكی وەبەرهێنانیشی پێویستە، ئەمانە هەموو وەك هەورە بانەكە دەبێ پێی هەڵسن، هەروەها وەك چیایەكە پێویستە جێگاكەی بگۆڕین. كەمترین سەر و سامان و بێ هێزترین دامەزراوە و دانانی زۆرترین كارگە، مەسەلەیەكە پێویستی بە پاڵپشتی كرێكارەكان و بەهرە جیاوازەكانیان هەیە. كە تەنها پیاوێك ناتوانێ بە هەمووی هەڵسێ، سەیرە كە ئابووریناسەكان تێبینی ئەم شتەیان نەكردووە، بۆیە پێویستە ئەو دەستكەوتەی كە سەرمایەداری بە دەستی دێنێ هاوسەنگی بكەین لەگەڵ ئەوەی دەیدا.

پێویستە كرێكار ئەو كرێیە وەربگرێ كە لە ماوەی كارەكەیدا یارمەتی دەدا، بۆ ئەوەی بژێ. كرێكار ناتوانێ بەرهەم بێنێ ئەگەر بەكارنەهێنێ.-واتا ئەگەر شتێك نەخوا-، هەر كەسێك كار بە مرۆڤێك بكا پێویستە نانی بداتێ و پێداویستییەكانی ئامادە بكات، كرێیەكی هاوسەنگیشی بدرێتێ. ئەمە یەكەم شتە كە پێویستە لە هەموو كارێكی بەرهەم هێناندا بگونجێنرێ ل٢١٥-٢١٦.

ئێستا كرێكارەكان لە یەكتر جیادەكەینەوە، دەبینین نرخی ڕۆژەكان بۆ هەریەكێكیان هەموو بەرهەمێكی تاكەكەسی تێدەپەرێنێ، هەرچەند خاڵی جیاكردووە، لێرەدا دەرناكەوێ. هێزی هەزار پیاو كە بۆ ماوەی بیست ڕۆژكار بكەن، نرخی بەرامبەری یەكسانە بە كاركردنی كرێكارێك "یەك پیاو" بۆ ماوەی "٥٥" پەنجاو پێنج ساڵ، هەرچەند هێزی هەزار كەسەكە وا دەكا كارەكە بە ماوەی بیست ڕۆژ تەواو بێ، كە ئەمە بە تەنها پیاوێك ناكرێ. بۆ ماوەی ملیۆن سەدە دووبارەی دەكەمەوە: ئایا ڕێككەوتنێكی دادپەروەرانەیە؟



نەخێر... جارێكی تر، كاتێك تۆ نرخی هەموو هێزی تاكەكەسی دەدەی پێویست ناكات بەهای هێزی كۆمەڵایەتی بدەی، لە ئەنجامدا مافی موڵكایەتی كۆمەڵ دەمێنێتەوە كە تۆ بەهایەكی دادپەروەرانەت نەداوە، لێرەدا كرێكار هەست دەكا، ستەمی لێكراوە، لە بڕی ئەوەی مافی بدرێتێ "ل٢١٧".

ئێستا لە ڕێگای كارەوە بەرەو یەكسانی دەڕۆین، لە ڕاستیدا هەموو هەنگاوێك لە هەنگاوەكان وردە وردە لە ئامانجەكان نزیكمان دەكاتەوە، ئەگەر هێزی كرێكار و هەوڵ و پیشەسازییەكانیان یەكسان بێ، ئەوە سەروەت و سامانەكانیش یەكسانن، ئەگەر كرێكار خاوەنی ئەو بەهایە بێ كە بەدی دەهێنێ "یخلقها" وەكو پێشتر خستمانەڕوو، ئەوە مەسەلەكە بەم شێوەیە دەبێ:

١- كرێكار دەبێتە خاوەن شت لەسەر حیسابی ئەو موڵكدارەی كە كار ناكات.

٢- كرێكار مافی خۆیەتی لە چوارچێوەی ئەو ڕێژەییەی كە بەكار بەشداری تێدا دەكا، هاوبەشی بەروبووم و قازانجەكان بكا، هەر چەند بەروبوومێك یا بەرهەمێك بە زەرورەت كۆمەڵییە.

٣- هیچ كەسێك بۆی نییە مافی موڵكایەتی هەموو شتەكان تەنها بۆ خۆی هەڵبگرێ، لەگەڵ ئەوەی كە سەرمایەی پاشەكەوت موڵكێكی كۆمەڵایەتییە.

هەرچەندە ئەو واقیعەی پەیوەستە بە بەشداریكردنی گشتییەوە لە هەموو جۆرێك لە جۆرەكانی بەرهەم، كە ناتوانین نەدژایەتی بكەین و نەبەدرۆی بخەینەوە. پێویستە — لە ئەنجامدا- هەموو بەروبوومە تایبەتییەكان بگۆڕین بە بەروبوومە كۆمەڵییەكان، بەو پێیەی هەموو بەرهەمێك كە لە دەستی بەرهەمهێنەوە دەردەچێ، دەبێتە موڵكی هەموو كۆمەڵگا "ل٤٠".

کرێکار، له کۆمەڵگایەکی قەرزداردا دەمرێ، بەبێ ئەوەی قەرزەکەی خۆی دەستبکەوێتەوە، بەڵام موڵکدار کۆکەرەوەیەکی دزە و نکۆڵی لەو کۆکردنەوەیە دەکا کە مومارەسەی دەکا، موڵکدار دەیەوێ نرخی ئەو رۆژ و مانگ و ساڵانەی بدرێتی کە سەروەت و سامانی تێدا کۆکردۆتەوە "ل٢٤١".

کۆمۆنی رێکخراو کە بە روونی موڵکایەتی رەتدەکاتەوە، تەنها لە چوارچێوەی کاریگەری راستەوخۆی حوکمەکانی موڵکایەتی تەماشای ناکا، کە بە شێوەیەکی پێشینەیی دانراون، موڵکایەتی خۆی لەسەر بنەمای ئەو تیۆرانە دەرکەوت، کە شیوعییەکان خستیانەڕوو. راستە ئەندامانی کۆمەڵە هیچ شتێکی تایبەت بە خۆیان نییە، هەرچەند کۆمەڵەی دەرەبەگایەتی خۆیان خاوەندارن، بە تەنها خاوەنی بەروبووم و کەلوپەلەکان نیین، بەڵکو خاوەنی کەسەکان و ئیرادەکانیشیانن "ل٣٢٦".

ئەمانەی کە لە رێگای هێز و لە رێگای فێڵەوە بە دەست دێ، بە رووی دادپەروەریدا یەکدەگرن، بە دامرکاندنەوە کۆتاییان دێ لە بەرامبەر یەکسانیدا، بەم شێوەیە دەبینین کە سەروەری ئیرادە لە بەرامبەر سەروەری عەقڵدا دێتە خوارەوە "تتنازل" لە ژێر سۆسیالیستی زانستەکیدا بە نەمانی کۆتایی دێ. موڵکایەتی و پاشایەتی Royautè لە سەرەتای دونیاوە بەرەو هەڵوەشانەوە و لەناوچوون دەرۆن، وەکو چۆن مرۆڤ لە نایەکسانیدا بە دوای دادپەروەریدا دەگەرێ، ئاوهاش دەبینین کۆمەڵگا لە ئاژاوەگێڕیدا بە دوای سیستەمدا دەگەرێ "ل٣٣٩".

موڵکدار و دز و ئازا و پاشا خۆیان ئیرادەی خۆیان دەسەپێنێن، بەدەست هیچ دژکاری و چاودێرییەکەوە ئازار ناچێژن، چونکە لە یەك کاتدا دەسەڵاتی



یاسادانان "تشريعية" و دەسەڵاتی جێبەجێکردن "تنفيذية" بەدەست خۆیانە "ل٣٤١".

موڵکایەتی رەتبکەنەوە و پارێزگاری لە بنەمای خاوەندارێتی بکەن "التملك"، بەم گۆڕانە ساکارە لە پرەنسیپەکەدا "المبدأ" دەتوانن هەموو یاسا و حکوومەت و ئابووری و دامەزراوەکان بگۆڕن، هەروەها دەتوانن شەڕ لە زەوی دووربخەنەوە "ل٣٤٥-٣٤٦".

هەموو کارێکی مرۆیی بەزەرورەت لە هێزی کۆمەڵەوە بەرهەم دێ، بۆیە هەموو موڵکایەتییەك موڵکی کۆمەڵە و دابەش ناکرێ، لەبەر هەمان هۆکار: بە چەند وشەیەکی روونتر، کار موڵکایەتی تێکدەشکێنێ. لەگەڵ ئەوەی هێزی کرێکار وەك هەموو ئامرازێکە لە ئامرازەکانی کار چ سەرمایەی پاشەکەوتە، یا موڵکایەتی کۆمەڵی، دەبینن هەر جیاوازییەك لە مامەڵە و سەروەت و ساماندا بە جیاوازکردنی لەگەڵ توانادا، ئەوە دزی و ستەمە "ل٣٤٦".

سیاسەت زانستی ئازادییە: حوکمی مرۆڤ بۆ مرۆڤ سەرەڕای ئەو دەمامکەی کە خۆی لە پشت حەشارداوە، بریتییە لە چەوساندنەوە و سەرکوتکردنی، لێرەدا دەبینین بەرزترین بەرکەماڵبوونی کۆمەڵگا لە یەکێتی نێوان سیستەم و ئاژاوەگێڕیدا دەردەکەوێ "ل٣٤٦".

**له "یادنامەی دووەم"دا نامەیەك بۆ م. بلانکی دەربارەی موڵکایەتی ١٨٤١**

"مرۆڤ بۆ ئەوەی وەك پاشا بژی، پێویستە کاری ئەوانی تر بدزێ، کرێکار بکوژێ —موڵکایەتی باوەشێکی گەورەیە بۆ کلۆڵی و تاوانەکانمان- موڵکایەتی چلێسیە و گۆشتی مرۆڤ دەخوا، فێڵ و توندوتیژی و دزی چەند ئامرازێکن کە موڵکدار بە کاری دەهێنێ بۆ تاڵانکردنی کرێکار "ل١٧".

هەموو هۆکارەکانی جیاوازی کۆمەڵایەتی لە سێ خاڵ کورت دەکەینەوە:

١- دەستگرتن بەسەر هێزی کۆمەڵیدا، بەخۆڕایی.

٢- جیاوازی لە ئاڵوگۆڕکردندا.

٣- مافی بەدەستهێنانی قازانج و خۆشگوزەرانی.

لەگەڵ ئەوەی ئەم ڕێگا سێگۆشەیە کە بۆ تالانکردنی مافی خەڵکی بەکاردێ، بە شێوەیەکی سەرەکی ناوەڕۆکی موڵکایەتی پێکدەهێنن، دەبینن شەرعییەتی موڵکایەتی ڕەتدەکەمەوە و بە دزی دەچوێنم" ل١٢٦".

من بانگەشەی ئازادی کرێکار دەکەم، بەشداری نێوان کرێکار و خەڵکی، بە یەکسانیان لەگەڵ دەوڵەمەندەکان، هانی شۆڕش دەدەم بە هۆی هەموو ئەو ئامرازانەی کە دەمان گەیەنێ پێی: نووسین، ڕۆژنامە، قسە، کار و نموونە. ژیانم بریتییە لە مژدەیەکی بەردەوام "ل١٤٩".

## سەرهەڵدانی سیستەم لای مرۆڤایەتی یا بنەمای ڕێکخستنی سیاسی-١٨٤٣

کەم نین ئەو کەسانەی کە داناییەکی پتەو و عەقڵێکی بالایان هەیە، کە فکرەیەك وەکو ڕووناکییەکی لە ناکاویان لەگەڵدایە، بە مێشکیاندا تێدەپەڕێ و خەیاڵاتێکی تێدەچێ کە تاکە لە جۆرێتیدا. جوانترین نموونەی ئەم جۆرەش جان جاك ڕۆسۆیە، بەڵام شارل فۆرییەی نووسەری "جیهانی پیشەسازی" زیاتر نموونەی سیحرێکی زهنیە" ل٨٥". لە ڕاستیدا ئەو شڵەژانە فکریە گشتگیر و قووڵەی کە لە هێڵە پانەکانیدا پەیڕەوی لێدەکا، دەتوانێ هەموو وەهمە زانستی و سیاسی و ئایینییەکانمان بۆ ڕاڤەبکات "ل٨٧". ئەو فەیلەسووفانەی کە قسەمان لەسەر کرد، بە پشتگیری کردنیان بۆ خێزانی بیروباوەڕەکان، ئەو



گرفتانەی پێ چارەسەر دەکەن، کە پەیوەست بوون بە مرۆڤ و کۆمەڵگا -لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەزموون و شیکردنەوە- بەو سەرقاڵییەی کە بیری مرۆیی دەستی پێکرد لە ماوەی هەردوو سەدەی چوار و پێنجی پێش زایین گەیشتە بەرزترین ئاستی چڕێتی، واتە ئەو چەرخەی کە یۆنان، سوکرات و ئەفلاتوون و سۆفیتەکانی بەخۆوە بینی "ل٨٩".

سیستەمەکەی هیگڵ "منظومة" جارێکی تر بۆ بیروباوەڕی سێینەی بەرەوی پەیداکرد، بەو پێیەی شیکارییەکان "حلوليون" و میسالیەکان و ماددییەکان گۆڕان بۆ سیستەمی سێینەیی "ثالوثين"، زۆر کەس پێیان وابوو کە نهێنییەکی مەسیحییە و لە ڕێگادایە ئاسایی بێت بۆ غەیبییەت "میتافیزیکا". بەم شێوەیە ((لەو تێبینیانەی کە پێشتر باسمان کرد و پەیوەست بوون بە ژمێریاری و ڕووەکناسی و ئاژەڵناسی.... خوێنەر ئامادەیە بۆ ئەوەی لەمە تێبگا)). دەبینن سروشت لە کۆی خۆیدا زیاتر بۆ جۆرێك لە پۆلێنی چوارینەی ئامادەیە نەك پۆلینی سێینەی، سروشت دەتوانێ بۆ زۆر پۆلێنکاری تر ئامادە بێ.

لە ئەنجامدا دەبینین بیرۆکەی داهێنانی پێشکەوتوو کە هیگڵ بانگەشەی بۆ دەکا، تەنها وەسفی دیدگایە کە لە نێوان هەزاران دیدگای وەك خۆی هەڵبژاردووە، ئەم وەسفەش ڕێکتر و پاکترە لەو سیستەمە دەبیە "النظام العشري"، ئاشکرایە ئەو دڵنیایەی کە کۆیکردەوە ناتوانێ جەخت لەسەر حەقیقەتی کۆتایی بکات، وەك چۆن جەختکردنێکی ڕەها لەسەر ڕاستێتی ئەو ژمارە سیستەمە "منظومة" ناتوانن بیسەلمێنن کە ئەمە تاکە سیستەمە، کە سروشت پەیڕەوی لێدەکا.

ماوە بڵێین کە ڕێکخراوەکەی هیگڵ بووە هۆی تاوانبارکردنێکی زۆر: هەندێك کەس سکالایان لەو زنجیرەیە کردبوو، کە تێیدا باسکرابوو، کە زۆرینەی جار

تەنها دروستکردنی زەمانەوانییەك بوو، کە لە نێوان خۆی و واقیعدا نەدەگونجا.
هەندێکی تر سکالاًیان لەو بەرهەڵستکارییەی نێوان دارشتەی یەکەم و دووەم دەکرد، کە بە گوێرەی پێویست تێبینی نەکرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا دارشتەی سێیەم لە دوو دارشتەی یەکەم و دووەم دروست نەدەبوو. لە راستیدا ئەو رەخنانە ناتوانن سەرسامان بکەن: هیگڵ لە بری ئەوەی چاوەڕێی رووداوەکان بکا پێشیان دەکەوت، ئەمەش دارشتەکەی زۆر کاڵ و نەگەییو دەکرد، لە بیری چووبوو کە دەتوانێ یاسایەکی کۆگیری و بە پێدانی راستێتی بە درێژەدان وازناهێنێ. دەتوانین بەیەك وشە بڵێین هیگڵ خۆی لەناو زنجیرەیەکی تایبەتدا بەندکردبوو، وای دەردەخست کە دەتوانێ لە -رێگای ئەم زنجیرەیەوە- راڤەی ئەو سروشتە بکا، کە راستیدا هەمە جۆرییەکی زۆر لە زنجیرە و رەگەزکانیدا هەیە "ل١٦٢-١٦٣".

بە شێوەیەکی لەناکاو درکم "پەیم" بە سەربەخۆیی رێکخستنی زنجیرە جیاوازەکان و مەحالبوونی سەرهەڵدانی زانستێکی سەرتاپاگیر کرد، وەکو چۆن درکم بە یاساکانی زنجیرەی ساکار "التسلسل البسیط" و رەگەزەکانی هاوسۆزی کرد ل "٢١٢". میتافیزیك لە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەسەڵاتی هەستێکی تایبەتدا کۆبۆتەوە، بۆ ئەوەی بمانخاتە سەر شتێك لە دەرەوەی بیرکردنەوەکان وەستاوە، میسالییەت چ خودەکی بێ یا بابەتەکی، بە ئەفسانە رۆپۆش کراوە، بەڵام گومانگەرایی Scepticisme و ئازارەکانی، هەرگیز ناتوانێ بمانگاتێ و تووشمان بێ" ل٢٨٨".

پێشکەوتنی کۆمەڵگا، بە پێشکەوتنی پیشەسازی و نزیکبوونەوەی ئامرازەکان لەبەرکەماڵبوون دەپێورێ، کەسێك کە نەتوانی و نەزانێ چۆن ئامێرێك بە کاردێ، ئەوە کەسێکی ناوازەیە "شاذ" و بوونەوەرێکی لەبارچووە: بەهیچ شێوەیەك مرۆڤ نییە. لێرەدا دووبارەی دەکەینەوە کە مرۆڤ لە نێوان هەموو زیندەوەرەکانی تردا تەنها ئەو کاردەکا. ئایینە کۆنەکان لەم راستیەدا بەڵگەی



نەفرەتی ئاسمانین: لە راستیدا کار لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان کەم بەرهەم و بە ئازاربوو. هەرچەند زانستی نوێ، جارێکی تر ناتوانی لە کاردا هیچ ئاشکرا بکا، تەنها شایەتێکی یەکلایکەرەوەی سەربەرزییە باڵاکانمانە "ل٢٩٨".

ململانێی نێوان کار و سەرمایە، ململانێیەکە، کە لایەنگرانی پێشکەوتن سکالاًیان لە دەست دەکرد، لە بری ئەوەی لە رێگای هاوبەشەکییەوە "الشراکە" ئەو جیاوازییەی کردوویەتی نێوان کرێکار و سەرمایەدار بهێڵنەوە، پێویستبوو بە ملکەچکردنی سەرمایە بۆ کار و بە گۆڕینی بە بەگزادەیەکی سەرمایەدار بۆ فەرمانبەرێك کە سەرپەرشتی ژمێریاری داهات و دابەشکردنی باج و سەرانە کۆتایی پێ بێ "ل٣١٣".

دیالێکتێکی زنجیرەیی "التسلسلی"، ئامرازێکە بۆ هەڵوەشانەوەی بەڵگەنامە "المیثاق" و رێکخستن و محاکمەکان و ئەو جبەخانە بەرێوەبەریانە، پشتی پێ دەبەسترێ، هەروەها وەکو چۆن لە تێکشانی پاڵنەرەکانی زۆرداری و هەڵکەندنی زۆرداری پشتی پێ دەبەسترێ. یەك کیلۆگرام بارود دەتوانێ بۆمبێکی پێ دروست بکرێ، بەڵام یەك لەم بیروباوەڕانە دەتوانێ هەزاران سەرباز بجوڵێنێ "ل٤٦١".

## لە "سیستەمی دژێکە ئابوورییەکان" ١٨٤٦، بەشی یەکەم

زۆربەی فەیلەسووفەکان، بەو پێیەی کە زمانزانن، تەنها بوونەوەرێکی عەقڵانی لە کۆمەڵگادا دەبینن، یا بەشێوەیەکی وردتر، ناوێکی رووت بە کاردێ بۆ پێناسەکردنی کۆمەڵە مرۆڤێك. زۆرجار لە کاتی منداڵیماندا، لە رێگای فێرکردنی یاسا سەرەتاییەکانەوە، دەگەین بە چەند ناوێکی کۆمەڵی، یا ناوی جۆر و پۆلەکان کە هەرگیز ئاماژەی حەقیقەت نین. لەم بارەیەوە پێویستە هەندێ شت بڵێم، هەرچەندە من کەمتەرخەم بووم سەبارەت بەو بابەتەی کە

لێی دەکۆڵینەوە. کۆمەڵگا، سەبارەت بە ئابوورییەکی حەقیقی بوونەوەرێکی زیندووە، کە زیرەکی و چالاکی خۆی هەیە، و پەیڕەوی لە چەند یاسایەکی تایبەت دەکا کە تەنها لە ڕێگای تێبینییەوە دەشێ ئاشکرا بکرێ. بوونی "وجود" کۆمەڵگا لە ڕێگای شێوەیەکی سروشتی بەرجەستەکراوەوە پێچەوانە نابێتەوە، بەڵکو پێچەوانە بوونی پەیوەستە بە گونجان و پابەندییەکی بە سۆزی نێوان هەموو ئەندامەکانی. بەو شێوەیەی کە پێشتر باسمان لە کۆمەڵگا کرد لە قووڵایی زمانەکەماندا هیچ دارشتەیەکی مەجازی تێدانەبوو، ئەو شتەی کە ناومان نا مرۆڤ، بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و یەکەیەکی ئەندامی "عضوی" هاوسۆزیە. لە دیدگای هەر کەسێکەوە ڕوونترین بیر دەربارەی یاساکانی کار و گۆڕینەوە... هتد دەبینین واقع و کەسایەتی مرۆڤی کۆمەڵی تەواو لە واقع و کەسایەتی مرۆڤی تاکی دەچێ. هەموو ئەم جیاوازیانەی کە لە تاکێکی مرۆییدا دەردەکەوێ، خۆی لەسەر شێوەیەی کۆئەندامیێ دەردەخا کە بەشەکانی ڕوویەکی ماددیانەی هەیە، کە زیرەکییەکە لە لای کۆمەڵگا ناتوانین نموونەی بدۆزینەوە، هەرچەندە زیرەکی و هەرەمەکی و پێشکەوتن و ژیان یا هەر شتێك کە حەقیقەتی بوونەوەرەکان دەردەخا —لەسەر بەرزترین ئاست- ئەمانە سەبارەت بە کۆمەڵگا و هەروەك بە مرۆڤیش، چەند مەسەلەیەکی جەوهەرین "ل١٢٣".

شتێکی نەشیاو، ئەستەم نییە، کە پرۆلیتاریا لە چوارچێوەی سیستەمەکانی کۆمەڵگای ئێستادا و لە ڕێگای پەروەردە و فێرکردندا بگاتە خۆشگوزەرانی، بەڵام شتێکی ئەستەمە لە ڕێگای خۆشگوزەرانییەوە بگاتە پەروەردە و فێرکردن، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەگەر پرۆلیتاری لادەینە لاوە مرۆڤ ئامێرێکە بێ توانایە لە هەستکردنی بە خۆشی و فێربوون. سەڵماندنەکە تەواو دەبێ، لە لایەك کرێ بە بەردەوام بەرەو نزمی دەڕوا لە بری ئەوەی بەرزبێتەوە، لە لایەکی ترەوە زیرەکییەکەی بە کەڵکی نایەت، واتە سەبارەت بەو هەڵگەڕانەوەیە بە



ئاراستەی بەربەریەتی و کلۆڵی دەبا. هەموو ئەو هەوڵانەی کە لەم ساڵانەی دوایدا لە فەرەنسا و بەریتانیا دران، بە ئامانجی چاککردنی بارودۆخی چینی هەژار و کاری منداڵ و ئافرەت و فێرکردنی سەرەتایی، تەنها شتێکی دروستکراوبوو بە ئاراستەی دژی بەها ئابوورییەکان و سەرەتاییەکانی سیستەمێکی جێگیر. پێشکەوتن، سەبارەت بە کرێکار بەردەوام کتێبێکی بە حەوت مۆر داخراو بووە. ئەم نهێنییەش، لە ڕێگای ڕاڤەکردنێکی یاسایی پێچەوانە چارەسەر ناکرێ "ل١٦٤".

مافی خودایی "الحق الالهی" یا بنەمای دەسەڵات لە ڕێگای ئامراز و کارگەوە چووە ناوجەرگەی ئابووری سیاسییەوە. سەرمایە، کارگە، تازیاری "الأمتیاز"، قۆرخکردن، موڵکایەتی، ڕاسپاردن "التوصیة"، ئەمانە هەموو لە فرمانی ئابووریدا، تەنها چەند ناوێکی هەمە جۆرن کە ئەمرۆ پێیان دەڵێن: دەسەڵات، دەسەڵاتکردن، ڕابەرایەتی، یاسای نووسراو، ئاین، خودا، یا هەموو ئەو چەمکانەی کە بوونەتە هۆی کلۆڵی و تاوانەکانمان، کە هەرچەند هەوڵی پێناسەکردنیان بدەین لە نێو دەستەکانماندا دەتوێنەوە "أفلتت".

ئایا دەبینن کە لەناو بارودۆخی ئێستای کۆمەڵگاکاندا ئەستەمە، کارگە و ئامێرەکان بۆ خزمەتی بەرژەوەندی گشتی بە کاربێ، لە بری ئەوە خزمەتی بە بەرژەوەندی چینێکی کەم دەکا، کە کەم کاردەکەن و زۆریش دەوڵەمەندن؟ ئەمەیە کە پیریر گورییە "هەوڵی بۆ دەدا" ل١٩٥".

خێزان جۆرێك یاخانەیەکی ئەندامی "عضوي" کۆمەڵگا نییە، بەڵکو لەناو خێزاندا "وەکو م.دی پۆناڵد تێبینی کرد، جێگای هیچ نییە، تەنها جێگای یەك بوونەوەری کۆمەڵایەتی و یەك زهن و یەك ڕۆح و یەك لاشەیە، وەکو کتێبی پیرۆز دەڵێ: خێزان لانکەی موڵکایەتی و Monarchie و باوکسالارییە Patriciat،

کە تیایدا بیرۆکەی دەسەڵات و سەروەری دەردەکەوێ و دەمێنێتەوە، کە لەناو دەوڵەتدا زیاتر دەپارێزرێ. لەسەر جۆری رێکخستنی خێزانی هەموو کۆمەڵگا کۆن و دەربەگییەکان رێکیان دەخست، بەڵام دیموکراسییەتی هاوچەرخ دژی ئەو رێکخستنە بە پاتریارکییە "بطريركي" کۆنەبوو. کارگە، یەکەی پێکهێنەری کۆمەڵگایە ل٢٣٨.

لە ئەنجامی پێشکەوتنی ئەو دژپێکە ئابوورییانە، وای کرد سیستەم "النظام" لە کۆمەڵگادا بە ئاراستەی پێچەوانە بڕوا، واتا لە بڕی ئەوەی لە پلەیەکی باڵادابنرێت لە پلەیەکی نزم دانراوە، لە بڕی ئەوەی قەبارەیەکی دیاری هەبێ، بە شێوەیەکی بە تاڵ بوونی هەیە، لە بڕی ئەوەی لە ژێر تیشکی رووناکی دابنرێ، فرێدراوەتە تاریکییەوە، بەم شێوەیە دەسەڵات -کە لە ناوەڕۆکدا وەك سەرمایەدارە- لە رێگای ململانێی ناو کۆمەڵگاوە دەبێتە جاسووس و زۆردار و ستەمکار و سەرپەرشتی پرۆسەی بەرهەمهێنیان دەکا، دەسەڵات لە بڕی ئەوەی ملکەچی بێ، پاشا و رابەرە.

چینی کرێکار، لە هەموو سەردەمێکدا هەوڵی خۆی داوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم دژکارییە، ئەمەش لە رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ پارچەیەکی رەسمیدا، بەڵام کلیلی ئەم چارەسەرە تەنها لە دەستی زانستی ئابووریدایە ل٢٨٩.

لە بەرامبەر ئەمەشدا، دەبینین ئەو دیاریکردنانەی زانستی ئابووری، یا ئەو دیاریکردنانەی کە هاوتای واقیعی مەسەلەکانن، پێمان دەڵێ دەسەڵات بریتییە لە زنجیرەیەك ئەرکی نابەرهەمهێن، کە پێویستە لەسەر رێکخستنی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی بەردەوام بەرەو هێنانەوەی "تقليص" بڕوا. کەواتە چۆن دەکرێ، ئەم دڵنیایە بێتەدی کە لەسەر زمانی ئابووری سیاسیدا بەرپەرچ دراوەتەوە، کە دڵنیایەکی "أمنية" خۆشەویستە لای گەل، لەگەڵ بوونی



بنەمای دەسەڵات کە خۆشەویستە لای دیموکراسییەکان، کەواتە چۆن حکوومەت لەناو ئەو گریمانەیەدا خزمەتکارێکی ملکەچ و دەستەیەکی ناوەندی دەبێ؟ ل٣٤٠-٣٤١.

دەسەڵات، ئامرازێکی هێزی کۆمەڵییە کە کۆمەڵگا وەکو ناوەندێك دوورستی کردووە، بۆ ئەوەی لە نێوان کرێکار و مرۆڤە خاوەن ئیمتیازەکان خزمەت بکا. بەڵام کاتێك خۆی دەبێنێتەوە -بە شێوەیەکی ناچارەکی- پابەندی سەرمایەداری بووە و دژی پرۆلیتاریا وەستاوە ل٣٤٥.

مەسەلەکە سەبارەت بە چینی کرێکار لە دەست گرتنی بەسەر دەسەڵات و قۆرخکاریدا دەرناکەوێ، بەڵکو لە دەسەڵات و قۆرخکاریدا دەردەکەوێ کە واتای گەیشتنییەتی بە دەسەڵاتێکی گەورە لە نێوان پۆلەکانی گەل و ناوچەرگەی کاردا، بەم شێوەیە دەسەڵات بە هێزتر دەبێ و دەوڵەت و سەرمایەش ملکەچی خۆی دەکات ل٣٤٥.

## لە "دژپێکە ئابوورییەکان" بەشی دووەم ١٨٤٦

سەرەتا، گرنگی بە لایەنی کار دەدەین. کار یەکەم تایبەتمەندییە لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ و یەکەم خوورەوشتی جەوهەرییە لە خوورەوشتەکانی مرۆڤ. مرۆڤ بۆ خۆی بوونەوەرێکی کرێکارە، واتا بوونەوەرێکی داهێنەرە ل٣٦١.

کەواتە کاری چییە؟ تا ئێستا چەمکێك بۆ پێناسە کردنی نییە، کار پەیامی رۆحە، کاتێك کار دەکەین واتە ژیانی خۆمان رازی دەکەین، کاتێك کار دەکەین —بە یەك وشە- بوونی خۆمان تەرخان دەکەین واتا دەمرین ل٣٦٢.

مرۆڤ لە ئەنجامی کار و تەرخانکردنی خودی خۆیدا دەمرێ ل٣٦٢. مرۆڤ دەمرێ لەبەر ئەوەی کار دەکا، ئەمەش جوانە، چونکە بە کرێکاری لە دایك بووە، چارەنووسی دونیایی مرۆڤ هیچ پەیوەندییەکی بە نەمرییەوە نییە ل٣٦٣.

هەرچەند ئێمە پێشتر زانیمان کە هیچ شتێك لەناو ئابووری کۆمەڵایەتیدا بە پشوی خۆی ناسووڕێتەوەو چێژ لە هیچ نموونەیەك لە سروشت وەرناگرێ، ئێمە ناچارین لە پێناو چەند کاروبارێك "أمور" کە نموونەیان نییە، چەند ناوێکی تایبەت و زمانێکی تازە دابهێنین، ئەوەش جیهانێکی باڵایە "متسام" کە بنەماکانی لە سەرووی بنەماکانی ئەندازە و بیرکارییەوەیە، توانای خۆیشی نە لە هێزی راکێشان و نە لە هیچ هێزێکی سروشتییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو ئەندازە و بیرکاری وەکو دوو ئامرازی ناوەندەکی بەکاردەهێنێ ل٣٨٩.

ئایا شتێکی تری بخەمە سەر؟ کار پرۆسەی بەرهەرمهێنانەوەی خودی خۆیەتی و لە واقیعی خۆیەوە وەری گرتووە ل٣٨٩. ئەو جیهانەی کە چوار دەوری داوین و لەناو ماڵ بڵاو بۆتەوە و دەمانجوڵێنێ، بەبێ ئەوەی بیبنین، تەنها لە رێگای کارامەی و زرنگی خۆماناوە نەبێ، بەبێ ئەوەی بتوانین دەستی لێ بدەین تەنها بە هۆی بەڵگەکانییەوە نەبێ، ئەم جیهانە سەیرەش کۆمەڵگایە... ئەوە ئێمەین! ل٣٨٩. ئەو جیهانە چییە، کە نیوەی ماددیە و نیوەی بەهۆی عەقڵەوە هەستپێکراوە، ئەو جیهانە چییە؟ کە نیوەی زەرورەتە، نیوەی خەیاڵ، ئەو هێزە چییە کە داوامان لێ دەکا کار بکەین ئەو هێزەی وامان لێدەکا کە زیاتر هەست بە ئازادی بکەین؟ ئەم ژیانە بە کۆمەڵییە چییە؟ کە ئاگرەکەی دەمانسوتێنێ و هاوکاری خۆشی و پەژارەکانیشمانە؟ ل٣٩٠.

بەم شێوەیە ئەم زانستە بە نورینی ئێمە، زانستێکە هیچ شتێکمان پەیوەست بە خۆی ناداتێ، نە لە رێگای ئەزموون و نە لە رێگای عەقڵەوە، زانستێکە مرۆڤایەتی و هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن پێوەی، بە خۆی پوخت دەکاتەوە، ئەم زانستە لە بڕی ئەوەی وەك زانستەکانی تر لە پێناسەکردنێکی عەقڵانە بۆ واقع



دەربکەوێ، خۆی داهێنەری عەقڵ و واقعیە، بەم شێوەیە مرۆڤ داهێنەری عەقڵی ئابووری و ئەندازیاری سیستەمە ئابوورییەکانە، هەروەها داهێنەری ماددەی ئابوورییە، مرۆڤایەتی دوای ئەوەی عەقڵ و ئەزموونە ئابوورییەکانی بەرهەمهێنا، هەستابە دروستکردن و داهێنانی زانستی کۆمەڵایەتی "کۆمەڵناسی" ل٣٩١.

ئایا ئەتانەوێ مرۆڤ بناسن و دیراسەی کۆمەڵگا بکەن، ئایا دەتانەوێ کۆمەڵگا بناسن و دیراسەی سروشت بکەن؟ مرۆڤ و کۆمەڵگا بە گۆڕینەوەی وەك خود و بابەت و بەهاوسەنگی و هاوشێوەی نێوان هەر دوو زانستەکە خزمەتی یەکتر دەکەن لە کۆتایی بەرکەماڵبوون ل"٣٩٣".

## پاشکۆی سیستەمی دژپێکە ئابوورییەکان

ئەو تێبینیانەی کە پرۆدۆن لە پەراوێزی کتێبەکەی کارل مارکس "کلۆڵی فەلسەفە" نوسیوویەتی:

"شتێك کە لێی تێنەگەیشتووی، ئەوەیە کە ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دیاریکراوانە، مرۆڤ خۆی بەرهەمییان دێنێ وەکو چۆن حەریر و سوف بەرهەم دێنێ "رەخنەی مارکس لە پرۆدۆن".

المخاتلة: ئەو شتەی بە دیاریکراوی وتم: کۆمەڵگاکە یاسا ئەزموونکاری و کەلوپەلەکانی بەرهەمدێنێ ل٤١٦.

ئایا دەبینن کە من، لە کلۆڵی بیردا وەکو ئێوەم! ئایا هەرگیز بینیوتانە وام دەرخستبێ کە بنەماکان شتێکی تر بن نەك چەمکێکی زهنی هەروەها هۆکاری لە دایکبوونی واقیعەکان نەبن؟

تێبینییەکانی پێنجەمتان تەنها ئەو پەڕی درۆ و بووختانن بۆ من. مانای حەقیقی کتێبەکانی مارکس، ئەوەیە داوای لێبوردن دەکەم، چونکە لە هەموو لاپەڕەیەکی کتێبەکەم، وەك من چۆنم کردووە ئەویش ئاوهای بیرکردۆتەوە! خوێنەر ئازادە لە پەی بردنی بەوەی کە ئایا مارکس دوای ئەوەی منی —واتە کتێبەکانی- خوێندۆتەوە، وەك من بیری کردۆتەوە یا نا "ل٤١٨".

## له "دانپیانانەکانی شۆڕشگێڕێك" ١٨٤٩

من له لایەن رەش و رووتەکان و رۆژنامەوانانی پرۆلیتاریا هەڵبژێردراوم، بۆیه پێویسته له سەرم ئەم جەماوەرە بەبێ رابەر و ئامۆژگاری بەجێ نەهێڵم، سەد هەزار مرۆڤ مافیان پێداوم گرنگی به کێشەکانیان بدەم ل"١٧٠".

پێویسته مەعنەویاتی کرێکاران بەرزبکەمەوە، تۆڵەی شۆڕشی حوزەیران بکەمەوە له درۆیی دواکەوتوویی، پێویسته کێشەکان به هێزێکی زیاترەوە، بەڵکو به جۆرێك له تۆقاندن بخەمەڕوو "ل١٩٢".

رێکخستن و کار و بەشداری و هاوبەشی کردن جەختکەرەوەی پێکهاته کۆمەڵایەتییەکانن، هەرچەندە پێکهاته کۆمەڵایەتییەکان پێکهاته سیاسییەکان له پلەی دووەم دادەنێ یا هەر رەتی دەکاتەوە، کەواته چۆن داوا له حکوومەت بکرێ دەستپێکەری پێشکەوتنێکی وا بکا؟ پێشکەوتن به لای حکوومەتەوە، به ئاراستەی پێچەوانەی ئاراستەی کرێکارەوە دەڕوات: مێژوو شایەتی ئەوەیه که حکوومەت له بڕی ئەوەی پێشبکەوێ، بەردەوام بەرەو دواوە گەڕاوەتەوە ل٢٢٨.

## "بنەمای گشتی شۆڕش له سەدەی نۆزدەهەمدا" ١٨٥١

ئەی بورژواکان، ئێوه زۆردار و نکۆڵ لێکەری جوانین: ئەو سەرکوتکارییەی که دوای رۆژانی حوزەیران هاتن داوای تۆڵەکردنەوە دەکەن، ئێوه لەگەڵ دواکەوتوییدا رێکەوتوون سووك و ریسوا دەبن ل"٩٥".

هیچ کەس ناتوانێ نه شۆڕش سەرکوت بکاو نەفێڵی لێبکاو نەناشرینی بکاو نەهەرەسی پێبێنێ. هەرچەند هەوڵی کوژانەوەی شۆڕشتاندا، ئەوەندە زیاتر هێزی هەڵگیرسانی زۆرتر بوو و کردتان به کێشەیەك که بەرگری ناکرێ ل"١٠١".

گێل و گەوالییەکانی حکوومەت وای له شۆڕشگێڕەکان کرد که زانستێك بۆ خۆیان دروستبکەن، بەبێ تابووری دواکەوتووەکان که هاوەڵی له شەکانمان بوون و نەمان دەتوانی بڵێین ئێمه سۆسیالیستین، بۆ کوێ چوون له کوێن؟ ل"١٠٩".



رژێم "النظام" چی دەوێ؟ دەیەوێ پێش هەر شتێکی تر دەرەبەگایەتی سەرمایەداری به مافەکانی خۆیەوە بهێڵێتەوە، دەیەوێ سەر پەرشتیکردنی سەرمایەداری بەسەر کاردا دەستەبەر و زیاد بکا. رژێم دەیەوێ ئەگەر بکرێ له رێگای رێکخستنی کرێکار و کارگەکان له هەموو جێگایەك چینی مشەخۆر پەرەپێبدا، دەیەوێ به یارمەتی ئەرکه گشتییەکانەوە دووبارە موڵکایەتی زەبەلاح پێکبهێنێ و توند بکا ل١٤٧.

پێویسته له بەرامبەر کۆماردا کۆمەڵگا دابمەزرێ، بەڵام ئەمه به حکوومەت نەبێ ناکرێ... بۆیه چەقی مەرکەزی زیاد بێ بەبێ ئەوەی کۆمەڵگا به هیچ دامەزراوەیەکەوە بتوانێ بەرهەڵستکاری بکا، دەیانەوێ کاروبارەکان له رێگای زۆر بڵێی بیروباوەڕە سیاسییەکان و نکۆڵی کردن له بیروباوەڕە کۆمەڵایەتییەکان بگاته پلەیەك، که نەکۆمەڵگا و نەحکوومەت لەگەڵیدا هەڵنەکەن؛ کەواته مەرجی هەبوونی دووەم لەسەر ملکەچی و به کارهێنانی یەکەم وەستاوە ل"١٢٥".

ئەگەر سەد پیاو، هەوڵەکانیان یەکخەن نەك سەد به قەدەر ئەوەی که پیاوێك بەرهەمی دێنێ، بەڵکو دوو سەد یا سێ سەد یا هەزار به قەدەر ئەو بەرهەمدێنین. ئەمه پێی دەڵێن —هێزی کۆمەڵ- له ئەنجامدا دەگاته پوختکردنەوەی بیانوویەك سەبارەت بەم مەسەلەیە، که ئەم بیانووەش وەك مەسەلەکانی تر، بەبێ وەڵام دەمێنێتەوە، که دژی بارودۆخی هەندێ له موڵکدارەکان ئاراستەکراوە. بیانووەکە دەڵێ نابێ به پێدانی کرێی ژمارەی کرێکارەکان، بۆ دەستکەوتی بەربوومەکانیان به شێوەیەکی یاسایی وازبهێنین. بەڵکو پێویسته دوو یا سێ به قەدەر ئەو کرێیەیان بدرێتێ، خزمەتێکیان پێشکەش بکرێ له ئاستێك که هاوشێوەی هەر یەکێکیان بێ ل"١٦١".

بەڵێ، کارگه کرێکارییەکان، بەو پێیەی دژی کاری کرێن و جەخت لەسەر گونجان دەکەن "گونجانی کرێ لەگەڵ کار"، بەو پێیەی داواکاره رۆڵێکی سەرەکی بگێڕێ له

دوا رۆژی نزیکمان، ئەو رۆڵەی بە تایبەت هەڵدەستێ بە بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنی ئامرازەکانی کاری گەورە."ل١٧٥".

پێش ئەوەی زۆر بووەستین پێویستە بە چارەسەرێك بگەین، دەبێ بزانن من پەیڕەو کاری هەنگاوەکانی دەست بەسەراگرتنی هەموو موڵکایەتییەکانم.... کە دەست بە سەرداگرتنێك بێ بێ قەرەبووکردنەوە ل٢٦٤.

پۆلینکردنێکی سەرتاپاگیر هیواشکردنەوەی ناچارەکییە بۆ هەموو شۆڕشێك. ئێستا، شەست ساڵ ئاژاوەگێڕی مێرکانتلایەتی و ئابووری، شەوێك دێت هاوشێوەی شەوی "٤" چواری ئاب کە هەرگیز ناتوانن لە دەستی هەڵبێن ل٢٦٥.

بۆ جارێکیش بێ بزانن: لە توندترین بەرە ئەنجامی شۆڕش دوای رێکخستنی کار و موڵکایەتی، رەتکردنەوەی مەرکەزییەتی سیاسی و دەوڵەتە ل٣٣٦.

ئەی بورژواکان پێشتر دەتانووت کە کۆمار لە سەرووی ئاستی هەڵبژاردنە گشتییەکانەوەیە، ئەگەر ئێوە لەم دارشتەیە تێبگەن، دەزانن کە شۆڕش دەکەوێتە سەرووی کۆمارییەوە ل٣٥١.

## (مشتومڕ دژی لویس بلانس و بیارلیرۆ) ١٨٤٩-١٨٥٠

ئێمە دەوڵەت و حکوومەت رەتدەکەینەوە، چونکە جەخت دەکەینە سەر کەسایەتی و سەربەخۆی جەماوەر، ئەمەش مەسەلەیەکە دامەزراوەکانی دەوڵەت هەرگیز باوەڕیان پێی نییە ل٣٦٩.

بەڵام سەبارەت بە دەوڵەت، دەتوانین و پێویستە لە سەرمان چونکە سەرەڕای ئەو هەمەجۆرییەی رووخسارەکان، دەڵێن گرفتی رێکخستنی دەوڵەت لەگەڵ گرفتی رێکخستنی کاردا تێکەڵ و رووبەڕوو دەبنەوە، لە سەرمان پێویستە لە ئەنجامی ئەمەدا بارودۆخێك دروست بکەین کە کارگە لە پاککردنەوەی حکوومەتدا پشتی



پێ ببەستێ، بەبێ ئەوەی پێویستی بە یاسا دانەرێك یا پاشایەك هەبێ، ئەوەش لەبەر ئەوەی کار بەپێی یاسا تایبەتییەکانی خۆی رێکدەخاتەوە ل٣٩٥.

ئەم دوو گریمانەیە پاککردنەوەی ملکەچی مرۆڤ بۆ مرۆڤ و پاککردنەوەی دەسەڵاتی مرۆڤ لەسەر مرۆڤ، یەك گریمانەن ل٤١٠.

## "شۆڕشی کۆمەڵایەتی کە هەڵگەڕانەوەکەی ٢ی کانوونی یەکەم سەلماندی" ١٨٥٣

لە ساڵی ١٨٤٨، دەتوانم بڵێم زۆر پێش ئەوە، چارەنووسێك کەوتە ئەستۆی رابەرە سیاسییەکانی فەڕەنسا، ئەو چارەنووسەش گرفتی پرۆلیتاریا و گرفتی ئابووری بوو کە جێگای سیاسەتی گرتۆتەوە، هەروەها ئەو بەرژەوەندیانە بوو کە لە دەسەڵاتدا شاردرابوونەوە، بە کورتی: بیرۆکەی کۆمەڵایەتی بوو ل١١٨.

بەم شێوەیە گەلی فەڕەنسی، لە جەماوەرە قووڵەکەیدا، بە هەموو ئەو مەرکەزیەتەی کە چوار دەوری گرتبوو، ئەو قەشانەی کە ئامۆژگاری دەکردن و ئەو سوپایەی کە چاودێری دەکردن و ئەو رژێمە یاساییەی کە هەرەشەی لێدەکردن و ئەو پارتانەی "حزب" کە دژایەتی دەکردن و ئەو سەرمایەدار و مێرکانتلیەتەی کە گەلی فڕەنسی کردبووە موڵکی خۆی، جا گەلی فەڕەنسیان وەکو تاوانبارێك فڕێدابووە زیندانەوە و فەرمانی شەو و رۆژ چاودێری کردنی بەسەردا درابوو، بە زنجیرێك بەسترابۆوە و جلێکی شێتەکانیان درابوویە و دەسکێك پووشیان دەدرایە، بۆ ئەوەی لەسەر بخەون، نانێکی رەش و جامێك ئاویان دەدرایە بۆ ئەوەی بژین. کەی و لە کوێ گەلێکتان دیووە کە لەم گەلە زیاتر بێزار کرابێ و ئازار درابێ ل١٢٧.

بە نورینی هەندێ کەس، سەربەخۆیی بوونی پرۆلیتاریا وەك داماڵینی موڵکایەتیە (بورژوازییەت)، لە پێناو ئەمەدا پرۆژەکان زۆر و جۆراوجۆر بوون، بوونە

سەرچاوەیەك كە درۆ و تەڵەكەبازی تێدا بزر نەدەبوو، درۆ و تەڵەكەبازی ئەو دوو شتەی كە پارتی كوماری پێی بە ناوبانگ بوو. بە كورتی، ئەوان نەیان دەوێرا و هەرگیز ناتوانن بوێرن ل١٣٧.

لە دووی كانوونی یەكەم، جەماوەر ماندوبوون و نەیان دەتوانی ئالۆگۆڕ و دەستپێشخەری بكەن، بەڵام بورژوازییەت پەشۆكابوو، دەیویست پشتگیری رابەرێك بكات كە بتوانێ پارێزگاری لە بەرژەوەندییەكانیان بكات ل١٦١.

بەم شێوەیە لویس ناپلیۆن شۆڕشەكەی قبوڵ نەكرد، تەنها دوای دڵنیابوونی جێبەجێكردنی دواواكارییەكانی. هەروەها لە بری ئەوەی خۆی بە شۆڕشەكەوە پابەند بكات، چوو شۆڕشەكەی بە كەسایەتی خۆیەوە پابەندكرد، ئاوا لە كۆتاییدا كاتێ بینی كە هەموو لایەنەكان دژی ئەون كە نەدەیتوانی خۆی بداتە پاڵ لایەنێك و نەدەیتوانی لایەنێكی تایبەت بۆ خۆی دروست بكات، بۆیە ناچار بوو دوژمنەكانی پارچە پارچە بكات، لە پێناو مانەوەی خۆیدا- ناچار بوو جارێك باس لە شۆڕش بكا، جارێكی تر باس لە دژە شۆڕش بكات ل١٩٨.

ئەو مەسەلەیەی كە سۆسیالیستی هێرشی كردەسەر، دووی كانوونی یەكەم لە رێگای هەڵسوكەوتە ئاژاوە گێڕیەكانییەوە كە سەرپەرشتی بیروباوەڕەكانی دەكرد ئەو پەشۆكانەی كە تووشی بەرپرسانی بوو و لە رێگای ئەو دژكاریانەی كە مەراسیمەكانی پڕكردبوو و لە رێگای ئەو پرۆژانەی كە بڵاوی كردەوە و دواتر رەتی كردەوە و درۆ دەركەوت بێ بنەمایی و كڵۆڵی بنەماكان و جێگیربوونە رووكەشەكەی، سەلماند ل٢١٩.

دەبینین كە "٢" كانوونی یەكەم –بە هۆی هەڵەی چەند كەسێك و پێویستەكانی سەردەم مێژووییەكیان تۆماركرد- دوای ئەوەی هەوڵیاندا هەندێ چاكسازی باس بكەن، بۆ ئەوەی وەك ئەوانەی پێشووی خۆیان ملكەچی لادانی چەمكەكانی بن، بەڵام لە بەرزایی واقیعی كۆمەڵایەتییەوە كەوتنە دونیای برسییەتی كەسەكانەوە، بەبێ ئەوەی هیچ كەسێك بزانێ چۆن و بۆ ل٢٢٠.



شۆڕشی دیموكراسی و كۆمەڵایەتی پێكەوە، لێرە بە دواوە سەبارەت بە فەرەنسا و ئەوروپا مەرجێكی ناچارەكییە، رەنگە ئەمری واقیع بێ، بۆیە پەناگەیە كە دەتوانێ جیهانی كۆن لە هەڵوەشانەوەیەكی حەتمی بپارێزێ. "٢٦٦"

روداوی دووی كانوونی یەكەم، جارێكی تر ناهێڵێ سیستەمی دەرەبەگایەتی، ئەو دەرەبەگایەتییەی كە لە رووی سیاسی و ئایینییەوە هەرەسی هێنا، وەكو حەقیقەتێك لە بواری پیشەسازیدا دەربكەوێتەوە، لە كاتێكدا كە مەرج و یاساكانی كار رووبەڕووی ئەم كارە دەوەستنەوە ل٢٧٣.

ئەو شتەی كە تائێستا لویس ناپلیۆن كردوویەتی، تەنها خزمەتكردن بووە بە هاوپەیمانی –پیرۆز ئەویش لە رێگای لێدانی دیموكراسی و شۆڕشەوە. تاكە پاداشتنی ئەم كارەش لە لایەن هاوپەیمانی پیرۆزەوە بۆ لویس ناپلیۆن، تەنها ئاسانكاری و یارمەتیدانی و پارێزگاری لویس بووە، بەو پێیەی كە سەركوتكەر و رەقیبی شۆڕشە ل٢٧٧.

كەس ناتوانێ شۆڕش بخەڵەتێنێ، هەتا ئەگەر ئیمپراتۆرێكی زیندوو بێ، هەتا ئەگەر لە كاتێك بێ كە شۆڕش كپ بووبێتەوە، جیهانی هەموو كپ كرد بێ، هەروەها كەس بۆی نییە بەناوی شۆڕشەوە قسەبكا، هەموو ئەو بیروباوەڕانەی كە دژایەتی شۆڕش دەكەن رێزیان لێ دەگیرێ و بە هیچ دژكارێك وەڵام نادرێتەوە، ئەوەش لە كاتێكدا كە ئەو بەرژەوەندیانەی كە خزمەتی دەكا لە بیركراوە یا فرۆشراوە ل٢٨١.

ئەگەر واقیع شایەتی حەقیقەتی شۆڕش و هێزەكەی بێ، ئەو واقیعەی كە درۆی تیا نییە "دووی كانوونی یەكەمە ل٢٨٢. بەڵێ سۆسیالیزم دەترسێ و شانازی بەو راستییەوە دەكا، ترس نەخۆشییەكە وەك هەموو نەخۆشییەكانی تر كوشندەیە، بەڵام كۆمەڵگای كۆن هەرگیز ناگەڕێتەوە ل٢٨٣.

ئەلیزییە، ئەو رەگەزە لێڵەیە كە لە ناوەرۆكی خۆیدا مانای نییە، ئێستا لە لایەن دوو تێپەوە دژایەتی دەكرێ، كە بە پەرۆشییەكی یەكسانەوە دەیانەوێ دایماڵن، لە

راستیدا مەسەلەکە لەسەر ئەوە وەستاوە کە فەرەنسا شۆڕش دەناسێ یا دژکاری شۆڕشە ل٢٨٥. ئاژاوەگێڕی یا قەیسەرگەرایی ئێوە دەبینین، کە تەنها ئێوەن لە نێوان ئیمپراتۆر و کۆمەڵگادا زەرەرمەندن، ئێستا بڵێین بە کام لەم دووانە سەرسامن، ئەوەش لەبەر ئەوەی لویس ناپلیۆن —وەك مامی نییە- تەنها لە ڕێگای شۆڕش و لە پێناو شۆڕشدا، دەکەوێ ل٢٩٤.

## "فەلسەفەی پێشکەوتن" ١٨٥٣

تیۆرەی پێشکەوتن، شەمەندەفەری ئازادییە ل٤٣. ئێمە بە پاکی و چاکی ناگەین تەنها لە ڕێگای بزاوت و نوێبوونەوەدا نەبێ ل١٣١.

## ڕێنمایی ڕکابەرێ لە بۆرسەدا" و "رەچاوکردنە کۆتاییەکان" بۆ چاپی سێیەمی بژارکراو ١٨٧٥

دوو چاپی یەکەمی ئەم کتێبە "ڕێنمایی" بەبێ ناوی نووسەر بڵاوبوونەوە (....)، بەم شێوەیە ماددە خۆی پێشکەش دەکا وەکو چۆن لە کاری بانکیدا وتمان: ماددە کارێکی ناخۆش و بە ئازارە....، چی گرنگە بۆ خوێنەر ئەگەر بزانێ لە کارەکەیدا چی ڕوودەدا وەکو نووسەر، بە پێی داواکار دەکەین؟ ئەمڕۆ، ئەمە بارودۆخەکەمە کە گۆڕاوە ل١.

پانزە ساڵ زیاتر نییە، ئەو کەسانەی کە بەو وریاییەوە چاودێری بزووتنەوەی ئابووریان دەکرد و لە کاتی ئاشتیشدا فەلسەفەی یەك نەگرتنی رەگەزە کۆمەڵایەتییەکانیان بەرزدەکردەوە، بۆ ململانێی نێوان ئەو رەگەزانە بەڵگەیان دەهێنایەوە کە وەك دژکارییەکانی هەژمار ناکرێن. مەسەلەکە بە ئاژاوەگێڕی پیشەسازی، نموونە بالاّی ئابووریناسەکانی ئینگلیزەوە پەیوەستە، ئەو نموونە بالاّیەی کە فەرەنسییەکان دایانهێنا و ئێستا دەستیان کردووە بە ڕەخنەگرتن لێی و



بە ناعەقلانی و ناجێگیر وەسفی دەکەن. دەیانووت نموونەی ئەم بارودۆخە زۆر شەرمەزارکەرە و ناتوانین پشگیری لێ بکەین، لە ڕێگای یاریکردن بە بنەماکانی خۆی —لە ژێر پەستانی سەرمایەداری سەرپەرشتیکەر- گۆڕانی بۆ پێکهاتەیەکی داخراو "منغلقیة" یا دەرەبەگایەتییەکی پیشەسازی، بە دڵنیایەوە کۆتایی دێ.

ئاژاوەگێڕی پیشەسازی، دەرەبەگاییەتی پیشەسازی، بە نۆرینی ئەوان پلەپلەیەکی تەواوە، ڕۆژانێك گاڵتەیان بە پێشبینیکەران دەهات و بە سۆسیالیست و تۆباوی و مرۆڤدۆست و بە دوژمنی خێزان و موڵکایەتی پێناسەیان دەکردن ل٧.

ئەمڕۆ پێشبینییەکە هاتەدی، ئاژاوەگێڕی بەرەنجامە یاساییەکەی خۆی دی، لە یەك کاتدا بڕوا بە بیروباوەڕە کۆنەکان نەماو پاکژی گشتیش لەناوچوو. لێرەدا پێم وانییە کە هیچ کەسێك بڕوای بەهەر شتێك مابێ. کەواتە دەرەبەگایەتی پیشەسازی جێگیرە، هەموو کەموکوڕی و گەندەڵییەکی دوو ڕوویی و گومانـاوی ئاژاوەگێڕی کۆکردەوە:

سیستەمی ڕکابەڕێی ئاژاوەگێڕی و ڕێککەوتنی یاسایی. سیستەمی داکەوتنی حکوومەت و قۆرخکاری دەوڵەت. سیستەمی پیشە جووتبووەکان. کارگە و ئەنجوومەنەکانی هاوپەیمانان: کارگە ئامۆژگاری و گەوجەکان. سیستەمی قەرزی نەتەوەیی و قەرزی گەل. سیستەمی بەکارهێنانی سەرمایە بۆ کار. سیستەمی لاسەنگی مێرکانتلی و دزیکاری بۆرسە. سیستەمی بەرزکردنەوەی بەهاو جوڵاندنی موڵکایەتی. سیستەمی بەکارهێنانی دوارۆژ پێش ئێستا، وردە وردە هەژاری زیاد دەکا.

دواتر شتێك کە پێشبینییەکەرانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی نەیانتوانی پێشبینی بکەن، ئەوە بوو کە دەرەبەگایەتی پیشەسازی نەرمترە لە ئاژاوەگێڕی پیشەسازی، کە تەنها تەنگانەیەکە پێویستە پێیدا تێپەڕێ وەکو چۆن بە تەنگانەی یەکەمیشدا تێپەڕی.

ئاژاوەگێڕی و دەرەبەگایەتی، هەردووکیان بەرئەنجامی ناهاوسەنگی و ململانێ و جەنگی کۆمەڵایەتین، کە نە دەتوانرا چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە، تەنها لە ڕێگای

جەختکردنی هێزی زیاتر و دارشتەی سێ زنجیرەیی، کە پێیان دەگوت "ئیمپراتۆرییەتی پیشەسازی"، ئیمپراتۆرییەتی پیشەسازی تەنها بنەمای ئاژاوەگێری خۆیەتی و گواستنەوەی ئابووری کلاسیکی سیاسی رەسمی، بۆ شێواندن و دژکاری، شتێکی تر نییە. هەرچەند دژکاری نەماف و نەیەکسانی و نەئازادیە، بەبێ ئازادی و یەکسانی و ماف دژکاری هەرگیز کۆتایی نایە، بەڵکو تەنها دەگاتە قۆناغی سێیەمی خۆی ل٨-٩.

دەبینین ئەمرۆ حکوومەتەکەی ناپلیۆنی سێیەم، چ نرخێکی گەورە دەداتە پاداشتی ئەوەی کە دەیتوانی ئامرازێك بۆ گونجانی سێ دارشتە بدۆزێتەوە:

ئاژاوەگێری پیشەسازی و دەرەبەگایەتی پیشەسازی و ئیمپراتۆرییەتی پیشەسازی. ئێستا سان سیمۆنییەکان، نوچەدرانی دەرەبەگایەتی نوێ بەلاوە دەنێین، بە دوای ئیمپراتۆرییەتێکی شیمانەییدا دەگەڕێین و رووەو تەواوکردنی ئەو شۆڕشە دەڕۆین، کە لە ساڵی ١٧٨٩ لە رێگای جێگیرکردنی هاوسەنگی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەسەر بنکەی کۆماری پیشەسازی، کە لە رووبەڕووبوونەوەی گشتدا "الجیمع" دەستی پێکرد ل١٠.

ئەرکی من نییە کە ناوێکی تر بۆ دارشتەی چوارەمی ئەم زنجیرە ئابوورییە دابنێم کە پێشکەوتنەکەی بەرچاوی هەمووانەوە روونە: ئاژاوەگێری پیشەسازی، دەرەبەگایەتی پیشەسازی، ئیمپراتۆرییەتی پیشەسازی، لە کۆتاییدا کۆماری پیشەسازی. لە نێوان ئەم چوار دارشتەیە دەبینین یەکەمیان لە کۆتایی خۆی نزیکە، دووەم رووبەڕووە، سێیەمیان لە سەرەتایی خۆیەتی، بەلام چوارەم هێشتا کۆرپەیە. مێژووی کۆمەڵگاکان کاروباری زۆریان نەخستۆتە بەردەم تێڕوانینی فەیلەسووفەکان، کەواتە ئێمە چۆن دەتوانین شتیان لێ وەربگرین؟! ل١١.

دەرەبەگایەتی پیشەسازی، کە "فۆرییە" نزیکەی پەنجا ساڵ پێشتر پێشبینی کردبوو، کە قوتابخانەی سان سیمۆنی کاریگەری لەسەر هەبوو بە هێزی کرد، لە کۆتاییدا ئەم دەرەبەگایەتیە جێگیربوو و جێگای ئاژاوەگێری پیشەسازی گرتەوە و



شۆڕشێکی دوای خۆی جێهێشت. کە بەشێکی لە رێگای تازیارییەکان و "أمتیازات" و بەشێکی لە رێگای نەرم و نیانییەوە دروست کرد، هەروەها بە یارمەتییەکی بەردەوامی حکوومەتیش ل٤٣٩-٤٤٠.

ئاژاوەگێری پیشەسازی هۆشیاری خودەکی نەبوو و خۆی نەدەناسی، بەلام دەرەبەگایەتی پیشەسازی خۆی دەناسی و بەپێی بارودۆخەکان دەجوولایەوە. ئاژاوەگێری پیشەسازی نیازێکی پاك و باشی هەبوو، بەلام دەرەبەگایەتی پیشەسازی، ناوکێکی خراپی هەبوو و بێ رەوشت بوو، کە لە بواری ئابووریدا تەنها دەتوانین ئاماژە بەو بنەمایانە بدەین کە دایکی بۆی بەجێ هێشتوو و نەیدەتوانی بڕوای پێبکا ل٤٤٠.

بە یەك وشە، تەنگانە "الازمە"، بریتییە لە دەرەبەگایەتی پیشەسازی، لە هیچ جێگایەتی تر بە دوای هۆکاری ئەم تەنگانە سەرتاپاگیرە مەگەرێ کە بێ بەری نییە لێی. فەرەنسا بەم شێوەیە، تەوقی کۆیلایەتی خستە ئەستۆی خۆی، لە سەرخۆ بە بزاوتێکی بازنەیی، دەگەڕێتەوە سەر بیروباوەڕێکی دەرەبەگایەتی تەواو ل٤٤٨.

لەم کاتەدا، دەبینین گیانی شۆڕش بەردەوام هەیە و چاودێری دەکا، وەك چۆن دەرەبەگایەتی لە رێگای سەرکۆنەکردنی مافی ژمارەیەکی زۆری خەڵك قسەی دەربارەی شۆڕش دەکرد، بە واتای "یەکسانی". دەرەبەگایەتی نوێ بە سەرپەرشتی کردنی بە سەرکار و گۆڕینی بە تەنها بەکارهێنانی سەرمایەداری بۆ بەرژوەندی چینی مشەخۆر، بە رۆڵی خۆی داوای شۆڕشی دەکرد بە مانای کەرتکردن "أقتسام"، ئەو شتەی کە ئێمە پێی دەڵێین، پۆلینکارن.

بە یەك وشە و بەپێی یاسای دژکارییە مێژووییەکان، پێویستە دیموکراسی پیشەسازی، بە دوای دەرەبەگایەتی پیشەسازیدا بێ، ئەمەش بەرئەنجامی بەریەککەوتنی دارشتەکانە: وەکو چۆن بە دوای شەودا رۆژ دێ، بەلام ئەو کەسە کێیە کە بەم شۆڕشە هەڵدەستێ؟ مێژوو ناسنامەکەیمان بۆ ئاشکرا دەکات، لە نێوان دەرەبەگایەتی کۆن و شۆڕشدا شتێك هەیە وەك رژێمێکی گواستنەوەکی یا

رژێمێکی چەوسێنەر. لە نێوان دەرەبەگایەتی نوێ و پۆلینکاری کۆتاییدا، جۆرێك لە جەختکاری ئابووری هەیە، واتا: ئیمپراتۆرییەتی ئابووری ل٤٤٩.

چینە باڵاکان کە جێگای "بەگزادەی" کۆنیان گرتبووە و ئامانجیان دەستکەوتنی نازناوی بەگزادەبوو، وەکو چۆن رەوشت و داب و نەریتیشیان هەڵگرتبوو. ئەم چینە پێك هاتبوو لە چاودێریکەرانی دارایی و پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵی و زانیستەکان... هتد هەروەها. بەرێوەبەرانی کارگەکان و بە کورتی هەموو ئەوانەی کە داهاتان لە رێگای ئاڵوگۆڕی سەرمایەداری و قۆرخکردنی پشکەکان و تازیارییەکان و داهاتی موڵکایەتییەوە دەستدەکەوت، هەروەها فەرمانبەرانی دامەزراوەکان و پیاوانی ئاینی و سوپا و دادگاشی دەگرتەوە ل٤٥١.

چینی ناوەندی، کە پێشتر شانازیان بەوەوە دەکرد، کە حکوومەتی تەمسیلی "نوێنەرەکی" پشتگیریان دەکات، وردە وردە کەوتنە بارودۆخێکی خراپەوە کە تەنها قوناغی گواستنەوەکی بوو، هەروەها کەوتبوونە خۆشگوزەرانییەکی مشەخۆرەوە هەروەها کەوتبوونە نێوان هەژاری و ئازادی موڵکایەتی و کۆیلایەتی کرێ. لە راستیدا هەستی ئەم چینە بەرامبەر ئەم بارودۆخە وای لێیان کردبوو باوەڕیان بە هیچ پێکهاتەیەکی سیاسی نەمێنێ، بەمەش لە بێ ئومێدییەوە کەمتەرخەم ببوون، چاوەڕوانیان لە وڵات ئەوە نەبوو کە لەو چارەنووسە رزگاریان بکاو بارودۆخەکەیان بۆ چاك بکا، بەڵکو تەنها چاوەڕوانیان رزگار بوونیان بوو لە دەست ئەو شتانەی کە لە لایەن قەشەکانەوە دەهات ل٤٥٢.

ئەو شتەی کە رەوشتیان تەنها کار و کرێیە، ئێمە پێیان دەڵێین: چینی دونیا، لە چوارچێوەی ئەو بارودۆخەی کە بازرگانی و پرۆژەکان و پێشکەوتنی ئامێرەکان و دابەزینی نرخی دەستی کار و دابەشکردنی کار، بۆ کارێکاری دروست کرد بوو. وای لە کرێکار کرد بوو، کە تەنها ببێتە یەدەگی کۆیلایەتی و کڵۆڵی. چینی کرێکار زۆرترین چین بوون، هەرچەند ژمارەیان زیادی بکرادیە زیاتر کڵۆڵ دەبوون ل٤٥٣-٤٥٤.



دیموکراسی پیشەسازی: سەرپەرشتی کردنی کار بۆ کار، یا هاریکاری هەمبەری گشتی، کۆتایی تەنگانەکەیە ل٤٦٠.

بەچەند وشەیەکی تر، ئایا کار دەتوانێ وەکو سەرمایە خۆی بەرێوەببا، لە بڕی ئەوەی کە ئێستا کارێکی تاکیە ببێتە کارێکی کۆمەڵی و سەرپەرشتی دامەزراوەکان و موڵکایەتی دامەزراوەکان و بەرێوەبردنیان بکا، بە جۆرێك کە لە لایەك دەستەبەری سەرهەڵدانی ئازادییەکی یەکجارەکی بۆ چینی کرێکار بکا، لە لایەکی ترەوە بۆ نەتەوە پێشکەوتووەکان، شۆڕشێك لە پەیوەندی کار و سەرمایە لە بڕی ئەوەی لە دەوڵەتەوە هاتبێ، لە ئارامبوونەوەی کۆتایی دادپەروەری سیاسییەوە هاتبێ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەستە بە دوارۆژی هەموو کرێکارانەوە. ئەگەر وەڵامەکە ئیجابی "ئەرێ" بێ بێگومان دەبێتە هۆی ئەوەی جیهانێکی نوێ بەرامبەر مرۆڤایەتی بکرێتەوە ل٤٦٢.

هەرچەند یاسا بازرگانییەکانمان، ناتوانێ لەگەڵ بەردەوامی سەرمایەداری و سەقامگیری و ئاوابوونیشیدا نەرم و نیان بێ، هەروەك چۆن ناتوانێ لەگەڵ بنەمای بەشداریکردنی کرێکاران لە بەرێوەبەرایەتی و قازانجیدا نەرم و نیان بێ، هەروەها لەگەڵ بنەمای هاریکاری لە نێوان کۆمەڵەکان نەرم و نیان نییە ل٤٦٥.

ئێستا، لە بڕی ئەوەی کرێکاران لە بەرژەوەندی بەڵێندەران کار بکەن کە کرێکەیان دەداتێ و بەرهەمەکان بۆ خۆی هەڵدەگرێ، هاریکاری هەمبەری هەبێ لە نێوانیاندا کاتێك لە کارگەدا کار دەکەن، لێرەدا بەشداری لە بەروبوومی هاوبەش دەکەن و قازانجەکەی دابەش دەکەن.

بنەمای هاوکاری هەمبەری کە لە نێوانیان کرێکاری هەموو کۆمەڵەکان هەیە، تەنها گەیشتۆتە کۆمەڵە کرێکارییەکان، کە جۆرێکی مەدەنییەتیان "شارستانییەت" دروست کردووە، کە لە هەموو شارستانییەتەکانی پێشوو لە رووی سیاسی و ئابووری و جوانییەوە جیاوازە، شارستانییەتییەکە کە نە بە

دەرەبەگایەتی و نە بە ئیمپریالی دەگۆڕێتەوە، شارستانییەتێك كە سیستەمێكی دڵنیایی توندی هەیە، دژی زێدە بەهای بەرهەم و وەستاوی و ڕێگەگرتن و نەخۆشی و كڵۆڵی و بێ كاری، شارستانییەتێك كە هەمیشە و بەردەوام مافەكانتان پێشكەش دەكا و لەگەڵ هیچ جۆرێك لە جۆرەكانی چاكەكاری "احسان" مامەڵە ناكات ل٤٧٠. ٤٨١٤٨١٤

دامەزراندنی ئەو كارگە بێ هەژمارانەی، كە تاهەتایە مرۆڤایەتی كرێكار بەكار دەهێنێ، كە ژمارەیەكی زۆری خەڵكی فریودا بەو پێیەی كە ڕێگوزەرێكە بەرەو دواوە، لە كۆتایی شیكردنەوەكەدا تەنها قۆناغێكی گواستنەوەكی داهێنەرە. پێویستە ئەم كارگانە لە ڕێگای خۆیاندا هەموو ملكەچییەكی مرۆڤ بۆ مرۆڤ ڕەتبكەنەوە، بە هۆی ئاژاوەگێڕی پیشەسازی و تاكێتی پێش بڕكێیەكان "فردانیة المضاربات"، یەك كۆمەڵە دروست بكات، كە هەموو بەرهەمهێنەران بگرێتەوە ل٤٨٩.

## "دادپەوەری لە شۆڕش و كڵێسا" بەشی یەكەم ١٨٥٨

میتافیزیای نموونە باڵا، نەفیختە و نەشیڵنگ و نە هیگڵ، هیچ شتێكیان دەربارەی نەدەزانی، ئەم پیاوانە كە فەلسەفەكانیان پایەیەكی گەورەی هەبوو، كاتێك وایان پێشبینی دەكرد كە هەڵێنجانێكی پێشووی "ئەزموونێكی بەسەرچوو" Lepariori، لە ڕاستیدا هیچیان نەكرد بوو تەنیا تاقیكردنەوەی خۆی نەبێ، بەبێ ئەوەی بزانن ل١٩٨.

دارشتەی هیگڵی سێینەیی نەبوو، تەنها لە ڕێگای هیگڵ بۆخۆشی خۆیان یا بەهۆی ئەو هەڵەیەی كە كردی، نەبێ. ئەم مامۆستایە سێ داڕشتەی دەژمارد، كە لە ڕاستیدا دوو داڕشتەبوو، ئەو وای نەدەبینی كە دژكارییەكان چارەسەریان نییە، بەڵكو وای دەبینی كە دژكارییەكان ئامادەن بۆ ئەو لەرینە و ململانێیەی كە



دەتوانێ هاوسەنگییەكان بەدی بهێنێ، بە هۆی ئەمەوە دەبینین كە سیستەمەكەی هیگڵ بە گشتی، پێویستی بە تەكاندنێكی "نفض" سەرتاپاگیر هەیە ل٢١١.

كەواتە ئەو بیروباوەڕە سەرەكییە چییە، كە لە یەك كاتدا بابەتەكیە و خودەكیشە، حەقیقییە و رووكەشیشە، سروشتییە، مرۆیشە، تێڕوانینەكییە و هەستەكیشە، لۆژیكییە و هونەریشە و سیاسی و ئابووریشە، لۆژیكییە لە ڕێگای عەقڵێكی راهاتوو، عەقڵێكی رووتە، ئەو بیروباوەڕەی كە لە هەمانكاتدا جیهانی رەوشت و جیهانی فەلسەفەش دەجوڵێنێ، ئەم جیهانەی لەسەر بوونیات دەنرێ، ئەو بیروباوەڕەی كە سەرەڕای دوو لایەنی دارشتەیی كە هەموو پێشینەیی و باڵاییەك "الاسبقیة و علویة" رەتدەكاتەوە و حەقیقەت و میسالییەت لە پێكهاتەی خۆیدا دەگرێ؟ ئەو بیروباوەڕەش بیروباوەڕی ماف و بیروباوەڕی دادپەروەرییە ل٢١٥.

بەم شێوەیە دەبنین دادپەروەری چەند ناوێك بۆ خۆی دادەنی، ئەمەش بە پێی ئەو ئاراستەیەی كە بەرەو رووی دەڕوا. لەناو چوارچێوەی هۆشیاریدا كە باڵاترین چوارچێوەیە، ناوی دادپەروەری بۆ خۆی دادەنێ كە ماف و ئەركەكانمان دیاری دەكات، لەناو چوارچێوەی زهن و لۆژیك و بیركاریدا ناوی یەكسانی و هاوسەنگی بۆ خۆی داناوە. بەڵام لەناو چوارچێوەی خەیاڵدا ناوی نموونەی باڵای بۆ خۆی داناوە، كەچی لە سروشتدا ناوی هاوسەنگی بۆ خۆی داناوە، لە بەرامبەر هەموو ئەو وتەزا فكریانە، دادپەروەری لە ژێر ناوێكی تایبەت دەردەكەوێ، كە وەك مەرجێك پێویستە هەبێ."٢١٧"

بەڵام جیاوازی نێوان زانست و هۆشیاری وەك جیاوازی نێوان لۆژیك و مافە، كەچی لەناو رۆحماندا مەسەلەكان بەم شێوەیە بەرێوە ناڕۆن، لەبەر ئەوەی زانیاری سەبارەت بە ئێمە مەسەلەیەكە زیاتر واقیعی و ژیارییە، وەك ئەوەی كە دەروونزان و لۆژیكییەكان پێیان وابوو ل٢٢١.

نەوەیەکی بە تاڵن، خراپن و ڕێزیان نییە، ئەوانەی کە لە ژێر پەردەی گەڕانەوەی پیمپراتۆرییەتدا، قۆناغی بێ تامی و پڕۆپاگەندەی رەسمی و فێڵی ئاشکرایان کردەوە، ئەم نەوەیە بوون هێرشیان کردە سەر فەڕەنسا و ژەهراویان کرد ل٢٣٦.

حکوومەتی ئیمپراتۆری حکوومەتێکی بێ بنەمایە، سەرکەوتنەکانیشی درۆن، دەبی ماوەیەك چاوەڕوان بین بۆ ئەوەی بزانین کە تەنها تەنگانە و پەشێویە"ل٢٤٠"

لێرەدا دۆگمایی نییە، من بەراورد و پێناسە دەکەم، بەڵام من لە رێگای خۆمدا بە دوای دارشتەی ماف لەو راپرسییە سەیرانەی کە ملکەچی سایکۆلۆژیای وەهمییەتن، ناگەڕێم، بەڵکو من داوای ئەم دارشتە دەکەم و هەوڵی بۆ دەدەم لە چوارچێوەی دیاردە ئیجابییەکانی مرۆڤایەتی ل٢٨١.

لەم کاتەدا شۆڕش خۆی دیاری دەکات کەواتە دەژی، بەڵام ئەوانی تر گرنگ نین. ئایا لاشەیەك یا کەلاکێك دەتوانێ بوونەوەرێك رەتبکاتەوە، کە دەژی و بیردەکاتەوە؟

## "دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسا" بەشی دووەم ١٨٥٨

ماتریالیزم دەتوانین وای دیاری بکەین کە ماددەیەکی نهێنیێ ونبووە. ل٢٠. ئامۆژگارییەکە دەتوانین لە دوو وشەدا کورت بکەینەوە: مەکوژە، دزی مەکە. لە ئەرکەکانی خوداناسی مەسیحیدا ئەگەر هەوڵی زانینی ئەوە بدرێ کە مومارەسەی بەندەیی کردن، هەتا ئەگەر لە پشت ناوی کاری کرێشەوە خۆی مات کرد بێ، ئامرازێکی ناڕاستەوخۆ نییە بۆ کوشتنی گیان و جەستە، بەڵام بە مەرجێك ئەگەر کاری کرێ لەسەر دەستی سەرمایەدار و بەڵێندەر و موڵکدارەکان تالانکاری نەسەپاندبێ ل٥٤.

ئەگەر خاوەن کارەکان رێکبکەون، یا بەڵێندەرەکان هاوسۆزی بکەن یا کارگەکان یەکبگرن، وەزارەت ناتوانێ بەرامبەریان هیچ شتێك بکات، بەڵکو دەسەڵات پاڵ بە



بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان دەدا و هانیان دەدا. بەڵام ئەگەر کرێکارەکان ناڕەزییان دەربڕی و مانیان گرت —تاکە رێگای بە دیهێنانی داواکارییەکانیان- راستەوخۆ و بێ بەزەییانە سزا دەدرێن، تاوای لێدێ بە نەخۆشی گرانەتا و نەخۆشی تر دەمرن ل٧٧.

ئەو شتەی کە ئێمە داوای دەکەین سەبارەت بە موڵکایەتی، مومارەسەکردنی هاوسەنگییە... ئێستا ئەگەر دادپەروەری بەسەر ئابووریدا جێبەجێ بکرێ، تەنها هاوسەنگییەکی بەردەوام دروست دەبێ، نەك شتی تر. بۆ ئەوەی بیری خۆم بە شێوەیەکی روونتر بخەمەڕوو، دادپەروەری، ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە دووبارە دابەشکردنەوەی سەر و سامان، هیچ شتێکی تر نییە تەنها ناچارکردنی هەموو هاوڵاتیان و هەموو و دەوڵەتێك نەبێ، بۆ خۆگونجاندنیان لەگەڵ یاسای هاوسەنگی لە چوارچێوەی پەیوەندییە بەرژەوەندییەکان، کە لە هەموو جێگایەك ناوەڕۆکی ئابوورییە، پێشێلکردنی بەرووکەش یا بە ئەنقەست هۆکاری سەرەکی کلۆڵییە.

ئابووریناسەکان وایان دەرخست کە دیاریکردنی ئەم هاوسەنگییە کاری عەقڵی مرۆڤ نییە، پێویستە کاروبارەکان لێگەڕێین چۆنیان دەوێن ئاوا بڕۆن، ئێمەش هیچ نەکەین تەنها هەنگاو هەنگاو بەدوایدا بڕۆین، من دڵنیام ئەم بیروباوەڕە شێواندنێکی رووت و بێ مانایە ل٩٢.

دژکارییەکان هەرگیز چارەسەر نابن، لێرەدا کەموکوڕییە سەرەکییەکانی فەلسەفەی هیگڵ دەردەکەوێ. ئەو دوو دارشتەیەی کە هاوسەنگییەکەیان لێ دروست دەکرێ، جا لە نێوان خۆیان بێ یا لەگەڵ دارشتەیەکی دژکاری تردا، ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەنجامێکی چاوەڕوانکراو. هاوسەنگی پێکهاتەکەی بەو شێوەیە نییە کە هیگڵ تێیگەیشتووە ل١٥٥.

بۆ ئەوەی تەنها دەربارەی کۆمەڵە مرۆییەکان قسە بکەین نەك شتێکی تر، وادادەنێین کە تاکەکان —ژمارەیان هەرچەند بێ و بۆ هەر ئامانجێك بێ- کاتێك هەوڵەکانیان یەك دەخەن بەر ئەنجامی ئەم هێزە یەکگرتووە مەسەلەیە کە پێویستە

تێکەڵ نەکرێ لە نێوان ئەم و کۆی ئەو هێزە ژمارەییەی کە هێزی کۆمەڵەکەی پێکهێناوە.

کارگەیەك، لە چەند کرێکارێك پێکهاتووە کە کارەکانیان لە پێناو یەك ئامانج یەکخستووە، ئەوەش دەستکەوتنی ئەم بەروومەیە یا شتێکی تر کە خاوەن هێزێکی تایبەتە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە بەرهەمەکانی ئەم چەند کەسە زۆر باشتر و بەرزترە لەوەی کە کرێکارێك بە تەنها بەرهەمی دێنێ.

ئاشکرایە دەستەی کەشتییەك یا کارگەیەکی سەرپەرشتیکەر "التوصیة" یا ئەکادیمیاییەك یا تیپێکی ئۆرکسترا یا سوپایەك... هتد هەموو ئەم کۆمەڵانە بە جۆرێك لە جۆرەکان رێکخراون و هێزێکیان تێدایە، هێزێکی پێکهاتەیی و تایبەت بە خۆیان، کە لە سەرووی توانا و جۆری کۆی ئەو هێزە سەرەکییەی کە لەناو کۆمەڵەیەی پێکهێناوە ل٢٥٧-٢٥٨.

لە ئەنجامدا دەبینین سەرباری ئەوەی کە هێزی کۆمەڵی وەك هێزی تاکی واقیعێکی بابەتەکییە، یەکەم تەواو لە دووەم جیادەکاتەوە، بوونەوەرە کۆمەڵییەکان بوونێکی حەقیقیان هەیە وەك چۆن بونەوەرە تاکییەکان هەیانە ل٢٥٨.

ئەو کۆمەڵە چالاکانەی کە شاریان لێ پێکهاتووە، لە نێوان خۆیاندا لە بواری رێکخستن و بیروباوەڕ و ئەرك لێکجیاوازن، ئەو پەیوەندییەی کە پەکی خستوون ناگەڕێتەوە بۆ پەیوەندییەکی هاوکاری بە ئاست ئەو پەیوەندییە هەمبەرییەی "المتبادل" نێوانیان، بەم شێوە هێزی کۆمەڵی سیمایەکی هەمبەری هەیە لە بواری جەوهەریدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەقیقەتە ل٢٥٩.

میللەت لە رێگای کۆکردنەوەی هێزی تاك و پەیوەندی کۆمەڵەکان، یەك دەگرێ یا دروست دەبێ. بەم شێوەیە میللەت بوونەوەرێکی حەقیقییە سیمایەکی بەرزی هەیە، جووڵانەوەکەشی کاریگەری بەسەر هەموو بوون و هەموو سەر و سامانێکدا هەیە، بەم شێوەیە تاك پەیوەستی کۆمەڵگایە و هەڵقوڵاوی ئەو هێزە باڵایەیە کە لە نادیاری نەبوونەوە دابەزیوە و لێی جیابۆتەوە ل٢٦٧.



ئەگەر گریمانەی هەڵگێرسانی شۆڕشمان کرد، بێگومان لە دەرەوەدا لە رێگای یەکگرتنی گەلەکاندا ئاشتی جێی دەگرێتەوە، بۆ ئەوەی ئارامی لەناو خۆیدا بەرقەرار بکەین دەبێ لە رێگای هاوسەنگی بەهاو خزمەتگوزارییەکان و لە رێگای رێکخستنی کار و دووبارە لێکدانەوەی گەل لە چوارچێوەی موڵکایەتی خۆی بۆ هێزی کۆمەڵییەوە هەوڵی بۆ بدەین ل٢٨٢-٢٨٣.

## "دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسا" بەشی سێیەم ١٨٥٨

بیرۆکە "الفکرة"، بە هەموو وتەزاکانییەوە لە کارەوە لە دایك دەبێ و پێویستە بگەڕێتەوە بۆ کار، لێرەشدا کرێکار وەك ناوەندێکە، واتا هەموو زانیارییەکی پێشینەییە و میتافیزیاش لە کارەوە دەردەچێ و پێویستە وەك ئامرازێك خزمەت بەکاربکەن، پێچەوانەی ئەوەی ئێستا فێربووین، غروری فەلسەفی و رۆحانییەتی ئایینی کە هەردووکیان لە فکرەوە ئیلهامێکی زیادیان وەرگرتووە، بە شێوەیەکی لێڵ بە ئێمە گەیشتووە. لە ئەنجامدا پیشەسازی تەنها جێبەجێکردنی ئەو فکرەیە ل٦٩.

دوورتر لەمە بڕۆین: ئەگەر تێڕوانین و لە ئەنجامدا بیروباوەڕیش لە لای مرۆڤ لە کارەوە سەرچاوەی گرتبێ، نەك کار لە ئەنجامی تێڕوانینەوە، کەواتە پێویستە کار پێش تێڕوانین بکەوێ و پیشەسازییەکیش بەسەر فەیلەسووفێکدا باڵا بێ، ئەمەش پێچەوانەی ئەو حوکمە پێشینەیە، کە سەبارەت بە بابەتی پێشوو و واقیعی مەسەلەکان دامان ل٧١. کەواتە، بەشی یەکەمی پێشنیارەکانمان بەم شێوەیە: "بیر-فکرە" بە هەموو وتەزاکانییەوە، لە کارەوە لەدایك دەبێ یا بە چەند وشەیەکی تر، پیشەسازی، دایکی فەلسەفە و زانستەکانە.

ماوە بەڵگە بۆ بەشی دووەمی راستی قسەکانمان بهێنینەوە: پێویستە فکرە "بیر" بگەڕێتەوە بۆ کار، ئەمەش، واتا پێویستە فەلسەفە و زانستەکانی بگەڕێتەوە بۆ پیشەسازی، ئەم مەسەلەیە بە دڵنیاییەوە داروخانە سەبارەت بە مرۆڤایەتی. ئەم

بەڵگەیە بەم شێوەیە تەواو نابێ هەتا مەسەلەی ئازادی کار چارەسەر نەبێ. سەرەتا پێویستە ئەم مەسەلەیە لەناو دارشتەیەك بخەینەڕوو: کار دوو روخساری دژکاری هەیە، یەکەم خودەکییە و دووەم بابەتەکییە... کار لە ژێر روخساری یەکەمدا هەرەمەکی و ئازادە و بنەمای بەختەوەرییە، چالاکییەکە لەناو مومارەسەیەکی یاسایی پێویست بۆ راستێتی رۆح و جەستە، بەڵام لە ژێر روخساری دووەمدا کار بە ئازار و تێرکەرەوەیە، چونکە بنەمای کۆیلەیی و وەحشیگەری دروست دەکات ل٨١.

وتمان کتێبەکەی م. لی بلانکی "کرێکارە ئەوروپییەکان"، هیچ ئامانجێکی نییە تەنها سەربارکردنی ئەو رێبازە نەبێ کە پێویستە لە پێناو ملکەچکردنی کرێکاران پەیڕەوی لێبکەن، ئەو لاپەڕە زۆرەی کە بەشی چوارەمی کتێبەکەی لە ژێر ناوی "دادپەروەری" گرتۆتیە خۆی، هیچ نییە تەنها پەرەپێدانی بیروباوەڕەکانی بەرێز لی بلانکی نەبێ. بۆ ئەوەی بە درۆزنی، تاوانباری نەکەم هەوڵ دەدەم لێرەدا کورتەیەك لە رێبازەکەی لی بلانکی بخەمەڕوو. ئەم بەرێزە هەرگیز بڕوای بە یەکسانی مەرجەکانی سەر و سامان نییە، بڕوای بە دادپەروەریش نییە، لە بەرامبەر ئەمەشدا هەرگیز گومانی لە پێویستی سەرهەڵدانی هیرارکییەتی "پلەپەند" کۆمەڵایەتی نییە، لێرەدا دەبینین بە هەموو هێزی بڕوای خۆیەوە، دەیەوێ پارێزگاری لەو رەگەزانە بکات کە هیرارکییەت و موڵکایەتی و ئیمتیازی سەرپەرشتی پیشەسازی و سەرمایەداری و رەگەزە پێکهاتووەکانی کڵێسا و سەنتەرێتی "مرکزیە" و فەرمانبەران و سوپا و سەربازی کردنی ناچاری و کرێکار، پێکدەهێنن. لە کۆتاییدا پارێزگاری لە کرێکارێك دەکا کە رێکوپێك و جێگیر و ملکەچ بێ، بەڵام شۆڕشی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری، لی بلانکی بە هەموو هێزییەوە رەتی دەکاتەوە.

بەڵام وەکو پێشتر تێبینیمان کرد، لە پێناو خۆشبەختی کرێکار پێویستە هەموو پێداویستییەکانی بۆ فەراهەم بکرێ بۆ ئەوەی بەبێ دەنگی و گوێڕایەڵی بمێنێتەوە.



کەواتە خاڵی سەرەکی و مەسەلەی جەوهەری و گرفتی کۆمەڵایەتی حەقیقی بە لای، لی بلانکییەوە لە بەرێوەبردنی کارەکان وەستاوە، بەوەی پێویستە کرێکار کاری رۆژەکەی تەواو بکات بەبێ ئەوەی بیربکاتەوە تەنها لە خواردن و خواردنەوە و خەو نەبێ، ئەمەش چەند مەسەلەیەکن بەبێ ئەو هەمیشە ترسی شۆڕشەکەی هەیە ل١٣٢.

لی بلانکی ئەمەی ناوناوە: جێبەجێکردنی رێبازی تێبینی "المنهج الملاحظة" بەسەر ئابووری سیاسیدا. لەم بنەمایەوە لی بلانکی لیستێکی بە "٣٦" دەستەی جیاوازی کرێکاری داناوە، کە لە سوێد و رووسیا و تورکیا و ئەڵمانیا و بەریتانیا و فەڕەنسا... هتد تێبینیی بوونی دەکرێ ل١٣٣.

من وای دەبینم کە جەخت کردنە سەر ئەو جیاوازییە سەرەکییەی نێوان عەقڵی تاك و عەقڵی کۆمەڵی سوودی نییە، بەوەی کە یەکەم یارمەتی دەری زۆردارییە، دووەم نەیاری "مضاد" هەموو جۆرێکە لە جۆرەکانی ل٢٥٣.

ئێمە دەبینین عەقڵی کۆمەڵی، بێ وەستان و لە رێگای هاوکێشەکانییەوە ئەو رێکخراوە تێکدەشکێنێ کە هاوپەیمانی عەقڵە تایبەتییەکان دروستی کردووە: کەواتە عەقڵی کۆمەڵی تەنها لەم عەقڵانە جیاواز نییە، بەڵکو بەسەر هەموویدا بەرزتر و بالاترە ئەم بەرزییەش لە واقیعی زۆردارییەوە دێ، لە لای ئەوانی تر پلەیەکی تری هەیە کە لە بەرامبەریدا لەناو دەچێ و دادەرۆخێ ل٢٦٨.

بە نوڕینی من عەقڵی کۆمەڵی بەو ئەنجامی ململانێی یەکگرتووی هێزی تاکەکانە، نموونەی ئەمە لەم هێزەدا راستییەکی واقیعییە، لەگەڵ ئەوەی لەناو هەمان کۆڵەکەدا یەکدەگرن، لەبەر ئەنجامی ئەمەشدا دوو کۆڵەکەی سەرەکی بۆ هەمان بوونەوەر دروست دەکا، کۆمەڵەکانی هێز و عەقڵە.

ئەم عەقڵە کۆمەڵییە لە یەك کاتدا تیۆری و پراکتیکییە، ماوەی سێ سەدەیە لە رێگای کۆنترۆڵی جیهان و پاڵنانی شارستانییەتەوە دەستی بە پێشکەوتن کردووە ل٢٦٨-٢٦٩. هۆیەکانی عەقڵی کۆمەڵی بریتییە لە هەمان هۆی هێزەکانی

کۆمەڵی: کۆمەڵی کرێکاری، فێرکاری، کارگەی پیشەسازی، دانایی، هونەرمەندی، ئەکادیمیات، قوتابخانەکان، شارەوانییەکان، کۆمەڵەی نیشتمانی، یانە، سوێندخواردووەکان... ەاتە بەیەك وشە، کۆبوونەوەیەکی تەواوی نێوانی ئادەمیزادە...(ل٢٧٠).

بێ سوود نییە ئەگەر شتێك لە هیگڵ وەربگرم: هیگڵ نکوڵی لە ئازادی دەکرد و گاڵتەی پێ دەهات، وەکو چۆن سپینوزا، دیکارتی شێواند "أعد" هەروەها وەکو چۆن سپینوزا لە سیاسەتدا گەیشتە فکرەی زۆرداری رەها ل٣٨٣-٣٨٤.

کەواتە ئەو بزووتنەوەیە چییە، کە لە رێگای خۆیدا حوکمی ئازاد و مێژوو و چارەنووس دروست دەکات، لە یەك کاتدا هەڵدەستێ بە بەرزکردنەوەی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی و پێدانی نموونەیەکی باڵا پێی ل٢١٩.

لە ئامادەگی ئەم تێکۆشانە گەورەیە، بەرامبەر بەو کارە بەرزەی کە سروشت هەڵدەستێ بە گەڕان بە دوای خۆیدا تاقیکردنەوەی خۆی و دروستکردنەوەی و چارەسەرکردنی خۆی و دواتر دووبارە پێکهێنانەوەی خۆی بە رێگایەکی تر، گۆڕینی بنەما و رێباز و ئامانجی خۆی، ئایا دەکرێ نکۆڵی لە بوونی ئەرکێکی تایبەت لە لای مرۆڤایەتی، کە نەزیرەکی و نەخۆشەویستی و نەدادپەروەری بێ ل٤٢٢.

کەواتە پێشکەوتن چییە؟ ل٤٩٤، من دانی پیادەنێم کە من وەکو هەڵخەڵەتێنراوێك بەرامبەر ئەم بانگەشە فیزیۆلۆجی ـ سیاسییە وەستابووم، کە زۆر بەرامبەر ئەم تاقیکردنەوەیەی بێ دەنگی نەبووم ل٤٩٥.

نەخێر... چەمکی ئازادی لە سیستەمەکەی هیگڵدا هیچ رۆڵێکی نەبوو، ئەو سیستەمەی لە پێشکەوتنەوە نەهاتبوو. هیگڵ بە رێگای سپینوزا دڵی خۆی دەدایەوە "یعزی نفسه"، بەرامبەر بەو خەسارەتە. هیگڵ جوڵەی رۆحی ناونابوو ئازادی، جوڵەی سروشتی ناونابوو زەرورەت "پێویستی" پێی وابوو ئەم دوو جوڵەیە هاوشێوەن، بەم شێوەیە ئاستی بڵندی ئازادی و ئاستی نزمی ئازادی لەسەر ئاستی ئەو خودە وەستاوە کە بیری رەها دیاری کردووە ل٥٠١.



هەر کەس بڵێ ئاستی بڵندی ئازادی سیاسی، سەبارەت بە هاوڵاتیان لەسەر ناسینی خودی خۆیان وەستاوە، لە لایەن دەسەڵاتی رەهاوە مەحکوم دەکرێن، لە توانای دایە کە لایەنگرانی دیکتاتۆری هەمیشەی و مافی یەزدانی رێگابدا "یریح" ل٥٠١.

لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە پێشکەوتن، لە هەموو ئەو پێناسانەی کە بۆی کراوە، لە راستیدا نەواقیعی ئازادی و نەشایەدی بەرزیمانە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئاماژەی کۆیلایەتیمانە ل٥٠٩.

بە نۆڕینی من پێشکەوتن، پێش هەر شتێکی تر یەکێکە لە دیاردەکانی سیستەمی رەوشتی، کە جوڵەکانی خۆی بە پەلە بەسەر هەموو تواناکانی بوونەوەری مرۆیی — کۆمەڵی بێ یاتاکی- بڵاودەکاتەوە جا چ سەبارەت بە خراپە بێ یا چاکە.

ئێستا دەتوانین بڵاوبوونەوەی ئەم هۆشیارییە، لە دوو رێگاوە قسەی لێ بکەین، بە پەیڕەوێ لە رێگای چاکە و بەرزییەوە بێ، یا لە رێگای هەڵە و تاوانەوە بێ، لە حاڵی یەکەمدا ناوی لێنراوە بەڵگە هێنانەوەی مرۆڤ خۆی بۆ خۆی، یا خۆ نزیکخستنەوە لە بەرکەماڵبوون، لێرەدا ئەرکەکەی گەورەکردنی بێ سنووری توانای مرۆڤە سەبارەت بە ئازادی و دادپەروەری، هەروەها برەوپێدانی هەوڵ و توانا و ئامرازەکانی، لە ئەنجامدا بەرزکردنەوەی بۆ سەر ئاستی توانایی تێیدا: لێرەدا بنەمای پێشکەوتن دەردەکەوێ. بەڵام لە حاڵی دووەمدا، بزووتنەوەی هۆشیاریان ناوناوە گەندەڵکردن، یا هەڵوەشانەوەی مرۆڤایەتی خۆی بۆ خۆی، ئەم مەسەلەیە لە رێگای وردە وردە لە دەستدانی رەوشت و ئازادی و بلیمەتی و کەموکوڕی ئازایەتی و باوڕەوە روودەدات، لێرەشدا بنەمای دواکەتوویی دەردەکەوێ.

لە هەردوو حاڵەتەکەدا، مرۆڤایەتی لە تواناکانی کەمبۆتەوە، لەبەر ئەوەی هەموو شتێك پەیوەستە بە هۆشیاری و ئازادییەوە، بەو پێیەی بزووتنەوە، کە بنکەی دادپەروەرییە و بزووێنەرەکەشی ئازادییە، ناتوانێ پارێزگاری لە هیچ توانایەك "قدریە" بکات ل٥١٢.

ئەوە نموونە بالاّ نییە کە بیروباوەڕەکان بەرهەم دێنێ، بەڵکو روونی دەکاتەوە "ینقیها"، هەروەها ئەوە نموونە بالاّ نییە کە شۆڕشەکان دروست دەکا و کارمان فێر دەکا و خزمەتگوزارییەکان پێشکەش دەکا و هێز و تواناکان هاوسەنگ دەکا و بتوانی بمانگەێنێ بەگەڕان بەدوای حەقیقەتدا و یاساکانی دادپەروەریمان پیشان بدا ل٥٤٦.

بەم شێوەیە دەتوانین تیۆرەی پێشکەوتن لە دوو وشەدا کورت بکەینەوە کە ئاسانە بۆمان مێژووییانە تێبینی حەقیقەتەکانیان بکەین:

-هەموو کۆمەڵگایەك لە ڕێگای کار و زانست و مافەوە پێش دەکەوێ، بە پێدانی روخساری نموونەی بالاّ ل٥٤٧.

- هەموو کۆمەڵگایەك لە ڕێگای سەروەری "هیمنة" نموونەی بالاّوە دوادەکەوێ ل٥٤٧.

لێرەدا دەبینین ئەدەبی فەڕەنسی نزیکەی نیو سەدەیە بڕیارڕیداوە بە هۆی نموونەی بالاّوە بژی و لە پێناویدا واز لە شۆڕش و ئازادی بهێنێ، بەمەش خیانەتی لە کێشەکەی خۆی کردووە، ئەم ئەدەبە وا خۆی پیشان دەدا کە عەقڵی سەردەمە، بەلاّم لە خزمەتەکانیدا هەتا یەك دژکاریشی تێدا نییە، ئەم ئەدەبە لە باوەشی میسالییەتدا ئاسوودەیە بەو پێیەی هیچ نموونە بالاّیەکی لە لانییە ل٦٤٢.

## "دادپەروەری لە شۆڕش و کڵێسا" بەشی چوارەم ١٨٥٨

دادپەروەری گەورەترە لە "من" "الآنا" ل٣٦٧. سۆسیالیستی بگۆڕی پێکهاتە و Synthese، هاوسۆزی گشتگیرە، ئەو شتەی کە سۆسیالیستی هێرشی دەکاتە سەر، ململانێی گشتگیرە ل٣٩٤. وتاری پرۆدۆن لە بەردەم کۆنگرەی سین لە ٢٨ ئازاری ١٨٤٩.



بە هۆی چەمکی حوکمی ئازادەوە، لەو نموونە بالاّیە تێدەگەین کە سەرسامی کردووین. ئەو پێشکەوتنە یاساییە لەسەر پێشکەوتنی ناچارەکی مرۆڤ نەوەستاوە، بەڵکو لەسەر سەربەخۆیی بێ سنووری هەموو تواناکانییەوە وەستاوە ل٤٣٢.

## "جەنگ و ئاشتی، لێکۆڵینەوەکان دەربارەی بنەما و پێکهاتەی مافی نەتەوەکان ١٨٦١

ئەو شتەی بە شێوەیەکی گشتی دانی پیانراوە، شارستانییەتە، کە لە ململانێوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە لە دەستکەوتەکانی ئەزموونە. کۆمەڵگا لە ژێر ئیلهام و کاریگەری جەنگەوە یا بە هۆی کاریگەری حوکمی هێزەوە پێشکەوتووە ل٩٢. مەسەلەکە روونە دروستبوونی کۆمەڵگا و شارستانییەت دوو مەسەلەن پەیوەندییەکی بە هێزیان بەو دارشتە ناروونەوە هەیە، کە پەیوەستە بە مافی جەنگ و مافی هێز ل٩٤.

هیگڵ و هۆبس، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە مەسەلەکە لەسەر زۆرداری حکوومەت و توانای گشتی دەوڵەت و سەرپەرشتی بەسەر تاکدا وەستاوە. من نازانم ئەگەر هیگڵ، بە هۆی ئەو بەشەی فەلسەفەکەی توانیبێی پارێزگاری لە یەك لایەنگری خۆی بکا لە ئەڵمانیا، بەلاّم دەتوانم بڵێم قسەکردن لەسەر جەنگ و مافی هێز بەم شێوەیەوە، تێکەڵکردنی خراپە و چاکە و راست و هەڵە، مەسەلەیەکە دەتوانێ فەلسەفە ناشیرین بکا ل١٠٧.

بۆ ئەوەی مەسەلەکان روون بن، جیاوازی وەستاوی نێوان مافی کار و ماف لە کاردا دەکەم، بەم شێوەیە: ماف، لە کاردا لە مافێکی رەهایی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە کە بوونی "وجوده" چالاکییەکی رۆژانە و مومارەسەی هەموو هێزەکانی دەوێ. بەلاّم مافی کار، لە خودی کارەوە سەرچاوەی گرتووە کە بە قەبارەی بەرهەمەکە پێوانە دەکرێ. بەلاّم لە "ماف لە کاردا" مەسەلەکە لەسەر

دەستکەوتن و جێبەجێکردنی بەرهەمەکە وەستاوە. کەچی لە مافی کاردا مەسەلەکە پەیوەستە بە کاری جێبەجێکراو کە جێبەجێکردنی کرێ و تازیاری "أمتیازات" دەوێ ل١٢٩.

بەم شێوەیە هێز، وەکو هەموو تواناکانی ترمان، بابەتیانە و خودیانە، بنەما و بابەتی مافە... ئەگەر ویستتان، پلەیەکی نزم لە پلەکانی دادپەروەری، بەڵام دادپەروەری خۆی: مەسەلەکان هەمووی دەچێتە چوارچێوەی تەواوکردنی کارەکانەوە ل١٣٠-١٣١.

ئێستا لەم نۆرینەمانەوە بۆ هێز، ئەگەر بە چاوی گرنگییەوە لە پێشکەوتنی ماف لە وتەزا سەرەکییەکانی بڕوانین، زنجیرەیەك ئاشکرا دەکەین کە دەتوانێ دڵی "فۆرییە" پڕ بکا لە خۆشحاڵی:

١- مافی هێز.

٢- مافی جەنگ.

٣- مافی نەتەوەکان.

٤- مافی سیاسی.

٥- مافی مەدەنی و ماڵی.

٦- مافی ئابووری، کە دابەشی دوو لق بووە: کەواتە وەکو دوو شت لێك دەچن: کار و گۆڕینەوە.

٧- مافی سیاسی یا مافی ئازادی بیروڕا.

٨- مافی ئازادی، بەو پێیەی کە ئەو مرۆڤایەتییە ناگەڕێتەوە، کە جەنگ و سیاسەت و دامەزراوەکان و کار و بازرگانی و زانست و هونەرەکان دروستیان کردووە، ئەو بزواتە ناگەڕێتەوە تەنها لە ڕێگای ئازادی تەواو و پەیڕەوی لە یاساکانی عەقڵی نەبێ.



لەم زنجیرە مافانەدا دەبینین کە "هێز" لە نزمترین ئاستیدایە و "ئازادی" لە بەرزترین ئاستیدایە ل١٩٢-١٩٣.

جەنگ، بە پراکتیکی، ئەوە نییە کە ئامانج و بنەماکان دەیسەپێنن، تیۆرە کە دەڵێ سپییە، بەڵام مومارەسەکردنی بەرەشی جێبەجێی دەکا. لە کاتێکدا کە بەرەو ماف دەڕوا، لە راستیدا لە خاپوورکردنی بەردەوامی خۆی دەرناچێ. لە نێوان واقیع و بیریشدا تەنها دژکارییەکی تەواو نییە، بەڵکو بێ بەریش نییە لێی. لە گرانی و ناخۆشی ئەو مەسەلانە کەمتر نییە کە پێویستە لە سەرمان چارەسەری بکەین. ئێمە دەزانین کە ئەستەمە پاکتاوی ململانێی نێوان ئەو دەوڵەتانە بکەین کە ترس و تۆقاندن ناشیرینی دەکا ل٢٢٧.

هۆکاری جەنگ کە هۆکاری هەموو شۆڕشێکە، ئەوە مەسەلەی هاوسەنگییە، هاوسەنگی ئابووری نەك هاوسەنگی سیاسی و جیهانی ل٣٨٤.

ئاشکرایە کە جەنگ ئەگەر لە پاڵنەرە نهێنی و شەرمەزارکەرەکانی پاکی بکەینەوە، کە لە ڕێگای ڕەتکردنەوەی تالآن و پێش بڕکێ و پشتبەستنەکانی جەنگ و هەموو جۆرەکانی دەست بەسەردا گرتن، دیاری دەکرێ، ئەگەر بە هەموو جۆرەکانی مافی مەدەنی و سیاسی و جیهانی کە خۆی دروستیان دەکا چوار دەوربدرێ. کاتێك خۆی دەبینێتەوە کە جەنگێکی بێ ئامانجە ل٤٢٥.

به کورتی جەنگ هەتا ئەگەر لە نێوان نەتەوە بەرێزەکانیش بێ، هەرچەندە ئەو پاڵنەرانەی کە دەیجوڵێنێ ڕەسمیش بێ هیچ ئامانجێکی نییە، تەنها جەنگێکە لە پێناو چەوساندنەوە و موڵکایەتی... جەنگێکی کۆمەڵایەتییە. ماوە بڵێین کە ئەگەر مافی ئابووری لە نێوان میللەتان دابنرێ وەك چۆن لە نێوان تاکەکان دانراوە، جەنگ جارێکی تر ناتوانێ ئەوە بکا کە لەسەر رووی گۆی زەوی کردی ل٤٦٥.

ململانێ ئامانجی وێرانکردن نییە لە پێناو وێرانکردن، ئامانجی سەرهەڵدانی بەرخۆری نییە، بەبێ بەرهەم، ئامانجی لە ناودان نییە لە پێناو لە ناودان، بەڵکو ئامانجی دروستکردنی سیستەمێکی هەمیشە باڵایە، کە نزیکبێتەوە لە کەماڵێکی

ناکۆتایی. لەم بوارەدا پێویستە دان بەوەدا بنێن کە کار، کێڵگەیەکی "حقل" پرۆسەکاری پێشکەش بە ململانێ دەکا کە زۆر فراوانتر و بە پیت ترە لەوەی کە جەنگ پێشکەشی دەکا ل٤٨٣.

بە کورتی تیۆرەی سەرهەڵدانی ئاشتییەکی گشتگیر و کۆتایی، مەسەلەیەکی یاسایییە "مشروعە". ئەو تیۆرەیەی کە لە یاسای ململانێ و کۆی دیاردە جەنگییەکان و ئەو دژکارییەی کە لە نێوان چەمکە یاساییەکانی جەنگ و هۆکارە ئابوورییەکانی ئاماژەی پێ دراوە، لە سەرپەرشتی کردنێکی زیاد کراو لە کۆمەڵگاکان، سەرچاوەی گرتووە ل١٨٧.

مرۆڤ لە ئاستی خۆیدا بچووکە، بەڵام مرۆڤایەتی خۆی گەورەیە و ناکەوێ، دەتوانم بە ناوی ئەو مرۆڤایەتییەوە بڵێم "مرۆڤایەتی جارێکی ئارەزووی جەنگ ناکات" ل٥١٠.

## "بنەمای فیدراڵی و زەرورەتی دووبارە دروستکردنەوەی پارتی شۆڕش" ١٨٦٣

فیدراڵییەت ناوێکی نوێیە، کە لە ساڵی ١٨٥٩ بە دەرکەوتنی لە بەرامبەر دیموکراسیدا ئازادی و یەکسانی و شۆڕش بە هەموو بەر ئەنجامەکانییەوە لەگەڵ خۆی هێنا ل٢٦٣.

واقیع بە سروشتی خۆی ئاڵۆزە، ساکارییش لە نموونەی باڵاوە سەرچاوەی نەگرتووە و ناگاتە بەرجەستە بوونیش ل٢٨٧.

ململانێی چینەکان لە نێوان خۆیاندا و ململانێی بەرژەوەندییەکانیان و ئەو رێگایەی بەرژەوەندییەکانیان پێ پێك دەهێنێ، ئەمانە چەند مەسەلەیەکن کە سیستەمی سیاسی دیاری دەکات، لە ئەنجامیشدا هەڵبژاردنی دەوڵەت حەقیقەتەکانی و هەمە جۆرییە زۆرەکانی دیاری دەکات ل٢٩٦.



ئەوەی جەوهەر و رەوشتی پەیمانی فیدراڵی، دیاری دەکات ئەوەیە کە هاوپەیمان "المتعاقدین" یا پەیمان بەستووەکان لە چوارچێوەی ئەم رێکخراوەدا بە شێوەیەکی تاکی بۆ خۆیان ماف و ئازادی و دەسەڵات و موڵکایەتی دەپارێزن، زیاتر لەوەی دەستبەرداری دەبن ل٣١٩.

بە کورتی، سیستەمی فیدراڵی دژکاری هیرارکییەت "المراتبیە"یان مەرکەزییەت بەرێوەبردن و ئەو حکوومەتەی کە خۆی لە هەموو دیموکراسییەکی ئیمپریالی و موڵکایەتی دەستووری و کۆمارێکی یەکگرتوو جیادەکاتەوە. بەڵام یاسای سەرەکی و جیاکەرەوەی ئەمەیە: لە چوارچێوەی فیدراڵییەتدا جەمسەرەکانی دەسەڵاتی مەرکەزی تایبەتمەند و دیاری دەکرێن، لە کاتی یەکگرتندا، لە کاتی هاتنە ناوەوەی دەوڵەتێکی نوێ ژمارە و چڕی و کارپێدانی فەرمانبەران کەم دەبێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە لە حکوومەتی مەرکەزیدا ژمارەی جەمسەرەکانی دەسەڵاتی باڵا زیاد و فراوان دەبێ، کە ئەرکەکانی سەرکردەش "الامیر" و کاروباری هەرێمەکان و شارەوانییەکان و داخراوە پیشەییەکان "المنفعات الحرفیە" و تایبەتییەکان دەگرێتەوە، ئەمەش بە پێی فراوانی رووبەری زەوی و زیادکردنی ژمارەی دانیشتووان ل٣٢١.

من تێگەیشتم و بڕیار دەدەم و بانگەوازدەکەم، ئەگەر پێویست بکات کە دەوڵەت دەستبخانە هەموو ئەو جێبەجێکردن و پرۆژانەی کە قازانجی گشتیان هەیە، بەڵام من ئێستا هیچ هۆکارێك نابینم کە داوای مانەوەی دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە بکا بەسەر جێبەجێکردن و پرۆژەکاندان، ئێستا کاتی پێدانەوەی دەسەڵاتە بە جەماوەر، من پێموایە نموونەی ئەم جەختکردنە بە فیڕۆدانی دابەشکردنی تازیارییەکانە ل٣٢٧.

بە هۆی ئەو بنەمایەوە، کە بەڵگەنامەی یەکگرتن و کاروباری بەرگری و هەندێ کاروبار کە قازانجی گشتیان تێیدایە دیاری دەکات، زەوی هەموو دەوڵەتەکان دەستەبەر دەکات، هەروەها دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی دەسەڵات و دەستوور و

ئازادی کۆمەڵایەتی ئەو هەرێمە، بەڵام زیاتر دەسەڵات و توانا و دەست پێشخەری دەپارێزی، بە جۆرێك زیاتر لەوەی وازی لێدێنن. هەروەها بە هۆی ئەم بنەمایەوە کۆنفدراڵی خۆی خۆی دیاری دەکات بە جۆرێك هەموو هەرێمەکان دوور دەکەونەوە لە چوارچێوەی ئەو هاوپەیمانییە، زیاتر و زیاتر لە یەکتر دوور دەکەونەوە، تاوای لێ دێ دوای ماوەیەك بەڵگەنامەکە دەبێتە بەڵگەنامەیەکی بێ ئامانج، ئەوروپا تا ئێستاش گەورەترە لەوەی یەك کونفدراڵی بێت: ئەو ناتوانێ هیچ شتێك پێکهێنێ تەنها کۆنفدراڵییەتی کۆنفدراڵییەتەکان نەبێ ل٣٣٥.

یەکێتی فیدراڵی تاکە شتە کە دەتوانێ وەڵامی پێداویستی و مافەکانی چینی کرێکار بداتەوە ل٥٤٧.

بۆ ئەوەی هاوبەشەکی "الشراکة" کرێکاری جۆرێك لە یۆتۆپیا بمێنێتەوە، هەرچەند حکوومەت تێناگا کە خزمەتگوزارییە گشتییەکان، پێویست ناکات بەو ڕێگایە جێبەجێ بکرێ و خۆی بداتە پاڵ کارگە کرێکارییە دەستەبەرەکان و بەرپرسەکان. ئیتر دەست تێوەردانی دەسەڵات بۆ کار بەسە... ل٥٤٨.

گەلێك، کە بە شێوەیەکی فیدراڵی یەکبگرن، ئەوە گەلێکی ڕێکوپێکن لە پێناو ئاشتیدا: کەواتە چ پێویستی بە سوپایە؟ ل٥٤٩-٥٥٠.

بیرۆکەی فیدراڵی، بەرزترین ئاستە کە تا ئێستا بیری سیاسی بیلمەتانە گەیشتووە پێی. ئەمە لە مێژە هەموو ئەو دەستوورەی فەرەنسای تێپەڕاندووە کە بۆ ماوەی حەفتا ساڵە تازە دەکرێتەوە. سەرەڕای سەرهەڵدانی شۆڕش کە بە هۆی کورتی ماوەکەیەوە نەتیوانیوە زۆر سەرپەرشتی وڵات بکات، بیرۆکەی فیدراڵی چارەسەری هەموو ئەو بەربەستانە دەکات کە ڕێکەوتنی نێوان ئازادی و دەسەڵات دەخاتە روو ل٣٥٢-٣٥٣.

مافی سیاسی پێویستە مافی ئابووری پەرەپێ بدا، ئەگەر بەروبووم و دابەشکردنی سامان بۆ ڕێکەوت جێ بهێڵێن و ئەگەر سیستەمی فیدراڵی بە پارێزگاریکردن لە ئاژاوەگێڕی سەرمایەداری و مێرکانتلی وازی هێناوە، ئەگەر، بە کاریگەری ئەم



ئاژاوەگێڕیە، کۆمەڵگا خۆی بینیەوە دابەشی سەر دوو چین بووە، کە یەکێکیان چینی موڵکدارەکان و سەرمایەدارەکان و بەڵێندەرەکانە و ئەوەی تر چینی پرۆلیتاریای کرێ گرتەن، ئەوا هەمیشە بارودۆخی سیاسی بە پێشێوی دەمێنێتەوە ل٣٥٤.

سەدەی بیستەم سەدەی کردنەوەی فیدراڵییەتەکانە ل٣٥٥. ئامانجی ئەم فیدراڵییەتە تایبەتیانە رزگارکردنی دانیشتووانی وڵاتە هاوپەیمانەکانە لە "ئیستغلالی" چەوساندنەوەی سەرمایەداری و بانکی، جا چ ئەم چەوساندنەوەیە ناوەکی بێ یا دەرەکی، ئەم فیدراڵییەتە لە نێوان خۆیاندا شتێك پێکدەهێنن کە پێی دەڵێن فیدراڵی - کشتوکاڵی-پیشەسازی. کە بەرامبەر ئەو دەرەبەگایەتییە داراییە لەم رۆژگارەدا سەرپەشتیارە ل٣٥٧.

بیرۆکەی فیدراڵی پیشەسازی کە وەکو تەواو ڕێك خزمەتی بە فیدراڵی سیاسی دەکا، ئەگەر لە خودی خۆیدا سەیری بکەین دەبینین هەموو بنەما ئابوورییەکان پشتگیریان کردووە ل٣١٩.

بنەمای فیدراڵی، لیبراڵی تازیاردار "بأمتیاز" چەند پێویستییەکی هەیە، یەکەم سەربەخۆی ئیداری ئەو پارچانەی کە هاتوونەتە ناوییەوە، پێویستی دووەم جیاکردنەوەی دەسەڵات لە هەموو ئەو وڵاتانەی کە دەسەڵاتدارن "سیادة"، پێویستی سێیەم فیدراڵییەتێکی کشتوکاڵی-پیشەسازییە ل٣٦٠.

هەموو بیروباوەڕە ئابوورییەکانی خۆم، کە ماوەی "٢٥" بیست و پێنج ساڵە پوختی دەکەمەوە، دەتوانم لەم سێ وشەیەدا کورتی بکەمەوە: یەکێتی پیشەسازی-کشتوکاڵی.

هەموو بیروباوەڕە سیاسیەکانم دەتوانم لە هاوکێشەیەکی ئاوادا کورتبکەمەوە: فیدراڵی سیاسی یا داماڵینی مەرکەزییەت. "٣٦١" بە کورتی، "کێ بانگی ئازادی دەکا، با بانگی فیدراڵی بکا، یا بێ دەنگ بێ ....

"کێ بانگی کۆماری دەکا، یا بانگی فیدراڵی بکا، یا بێ دەنگ بێ....

"کێ بانگ دەکا، یا بانگی فیدراڵی بکا، یا بێ دەنگ بێ... ل٣٨٣

## "توانای سیاسی چینی کرێکار" ١٨٦٥

ماوەی دە مانگە، لێم دەپرسن کە رام چییە دەربارەی بەیاننامــەی هەڵبژاردنــەکان کە کرێکارانی "الستین الستون" بڵاویان کـردەوە، لـە راسـتیدا مـن زۆر دڵخۆشـم سەبارەت بە وریاییە سۆسیالیستییە، بە تایبەت لە فەرەنسا، زیـاتر مـافی خۆمــە سەبارەت بەم بابەتە دڵخۆشم... بێگومان لەگەڵ ئێوە و لەگەڵ "الـستین"دا رێکـم کە چینی کرێکار نوێنەری نییە و مافی خۆیەتی نوێنەری هەبێ، ئایا دەتوانم لەمە زیاتر هەست بە شتێکی تر بکەم ل٤٧.

بەڵام لە بواری بەشداری کردن لە هەڵبژاردنەکان، کە دەتوانرا بنــەما و دوارۆژی بــە هۆشیاری دیموکراسی ببەسترایەتەوە، لەم بوارەدا هاوڵاتیان لێیــان ناشـارمەوە کــە جۆرێك لە بەتاڵی دەبینم ل٤٨.

مەسەلەکە پەیوەستە بە بەڵگەهێنانەوە بۆ "بەرامبەر دیموکراسی کرێکاری کــە بــە هۆی ناتەواوی هۆشیاری خـودی خـۆی و بیروباوەڕەکـانی، بــە دەنگــەکانی خۆیــان پیشگیریان لە چەند ناوێك کرد، کە هەرگیز نوێنەری ئەوان نین" ئەو مەرجانەی کە پێویستە پارتێك بیبڕێ بۆ ئەوەی بچێتە ناو ژیانی سیاسییەوە ل٤٩.

بەدوو وشە، رەشوڕووتەکان تاکو ساڵی ١٨٤٠ هیچ نەبوون، کە دەتوانین بە ئاسانی لە چینی بورژوازی جیابکەینەوە، سەرەڕای ئەوەی ســاڵی ٨٩ لــە رێگــای مــاف و ئەمری واقیعەوە لە بورژوازییەت جیابوونەوە، ئەم رەشــوڕووتانە بــە هــۆی بــێ بــە شیکردنیان بە بەرهەڵستی کردنی چینی خاوەن زەوی و بەکارهێنەرانی پیشەسازی، بوون بە شتێك: ئێستا وەکو بورژوازییەت دەیانەوێ بن بە هەموو شت ل٦٢.



کێشەی جووتیارەکان هەمان کێــشەی کرێکــاری پیــشەسازییە، دوژمنــی هــەردوو تیپەکە خۆیانن ل٦٩.

.... رزگاری تەواو بۆ کرێکاران و نەهێشتنی کاری کرێ ل٧٠.

کەواتە توانای سیاسی چینی کرێکار دەگەڕێتەوە بۆ ئەم پرس و رایانە:

١- ئەگەر چینی کرێکار، لە رووی پەیوەندییەکانییەوە لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوڵەتــدا هۆشیاری خۆی بەدەست بهێنێ. ئەگەر —بەو پێیەی کە بوونەوەرێکی کۆمەڵایــەتی نابەرجەســتەی ئــازادە- لــە چــینی بــورژوا جیــابۆوە لەگــەڵ ئــەم چــینەدا جــۆری پەیوەندییەکانی خۆی جیاکردەوە، ئەگەر هاتوو پابەند بوو بە تێکەڵ نەبوونی لەگەڵ بوژوازییەتدا، دەتوانێ هۆشیاری خودەکی بەدەست بهــێنێ و توانــای سیاســی لــە لادروست دەبێ.

٢- ئەگەر بووە خاوەن بیروباوەڕێك، یا ئەگــەر بــۆ خــۆی چــەمکێکی داهێنــا کــە داهێنراوی خۆی بێ، ئەگەر یاســا و مــەرج و دارشــتەی بــوونی خــۆی ناســاند یــا پێناسەیکرد، ئەگەر چارەنووس و دوارۆژی خۆی بینی، ئەگەر لە پەیوەندیدا لەگەڵ دەوڵەت و نەتەوە و سیستەمی گشتیگیردا لە خۆی تێگەیشت، ئــەو کاتــە توانــای سیاسی لە لا دروست دەبێت.

٣- ئەگەر چینی کرێکار، لە پێناو رێکخستنی کۆمەڵگادا توانی کورتەی کــرداری تایبەت بە خۆی لەو فکرەیە جیاکردەوە، ئەگەر بە هــۆی داروخــانی بوژوازییــەت و گەڕانەوەی بۆ دواوە، دەسەڵاتی درایە دەست بتوانــێ سیــستەمێکی سیاســی نــوێ دابهێنێنی و پەرەی پێبدا ل٩٠-٩١.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم دەڵێم: بەڵێ چینی کرێکار بۆتە خاوەن هۆشیاری خــۆی و ئەگەر مێژووی ئەم خاوەن بوونەش دیاری بکەین ئەوە ساڵی "١٨٤٨"ە.

سەبارەت بە خاڵی دووەم دەڵێم: بەڵێ چینی کرێکار بیروباوەڕەکەی لەگەڵ هۆشیاری خودیدا دەگونجێ، کە بووە خاوەنی، ئەو بیروباوەڕە لە ناکۆکییەکی تەواو دایە لەگەڵ بیروباوەڕی بورژوازییەتدا.

سەبارەت بە خاڵی سێیەم، پەیوەست بە بەرەنجامەکانی سیاسی، بیروباوەڕی خۆی کورتی کردۆتەوە: دەڵێم نەخێر: چینی کرێکار لە خودی خۆی دڵنیایە، گەیشتۆتە نیوەی هۆشیاری بەو بنەمایەی کە بیروباوەڕە نوێیەکەی دروستی دەکات، بەڵام تا ئێستا نەگەیشتۆتە مومارەسەیەکی گشتی گونجاو و سیاسەتێکی گونجاو ل٩١-٩٢.

ئەمڕۆ نکۆڵی کردن لە جیاوازی نێوان ئەو دوو چینە، واتای زیاتر نکۆڵی کردنە، لەو جیابوونەوەیەی کە بووە هۆی ئەم جیاوازییە، کە پێشتر تەنها نائارامییەکی گەورە بوو، هەروەها واتای نکۆڵی کردنە لە سەربەخۆی پیشەسازی سیاسی و مەدەنی چینی کرێکار، ئەو سەربەخۆیەی کە تاکە قەربووکردنەوەیە کە تا ئێستا بەدەستیان هێناوە، واتای ئەوەی دەبێ، کە ئازادی و یەکسانی ساڵی ٨٩ لە پێناو ئەو دروست نەکراوە وەکو چۆن لە پێناو بورژوازییەت دروستکرا ل٩٤-٩٥.

کەواتە، دابەشبوونی کۆمەڵگای هاوچەرخ بۆ سەر دوو چین: چینی کرێکار و چینی موڵکدارەکان - سەرمایەدارەکان بەڵێندەرەکان دابەشبونێکی روون و ئاشکرایە ل٩٦.

کاتێك کە کرێکار و هەژار و نەزانەکان، کە هیچ دەسەڵات و هێزێکیان نییە، هەڵسان بە خستنەڕووی خۆیان و دروستکردنەوەی خۆیان و قسەکردن دەربارەی رزگاری و دوارۆژی خۆیان و گۆڕانی کۆمەڵایەتی، کە دەتوانن بە هۆیەوە بارودۆخی خۆیانیان پێ بگۆڕن و هەموو کرێکارانی پێ رزگار بکەن، دەبینین بۆرژوازییەتی موڵکدار و ناسراو و بە توانا هیچیان نییە دەربارەی خۆیان بیلێن، کاتێك لە ژینگە کۆنەکەی خۆیەوە دەرچوو، بینیمان بێ چارەنووس و بێ رۆڵی مێژوویی بوو ئەو ئێستا بێ ئیرادە و بێ بیروباوەڕە. بورژوازییەت کە جارێك بە شۆڕش و جارێك بە



پارێزگار، جارێك بە کۆماری و جارێك بە خۆشەویستی یاسا و هەندێ جاریش بەرەو شێوەیەکی نوێنەرەکی و پەرلەمانی، دەستیپێکرد. دواتر جارێکی تر هاتەوە تازیرەکی خۆیشی لە دەستدا، ئەو بورژوازییەتەی کە ئێستا نازانێ چ سیستەم سیستەمەکەیەتی، چ حکوومەتێك باشترە، ئێستا هەموو روخسار و تایبەتمەندییەکی خۆی لە دەستداوە، جارێکی تر ناتوانێ لە رێگای فرەیی و کرێکار و بلیمەتییەوە ببێتە چینێکی بە توانا و بیەوێ و بیربکاتەوە و بەرهەم بێنێ و مشت و مڕ بکا و فەرمان بکا و حوکم بکا، بەڵکو وەکو کەمایەتییەك هەڵدێ و مان دەگرێ و وەکو گێلە شێوێنییەك و ئاژاوەگێڕێك دەردەکەوێ ل١٠٠.

بوژوازییەت ئەمە بزانێ یانەزانێ، رۆڵی ئەو کۆتایی هاتووە، ناتوانێ دوورتر بڕوا، و ناشتوانێ جارێکی تر خۆی دروست بکاتەوە ل١٠١.

شتێکی گرنگتر، سەبارەت بە دیموکراسی کرێکاری ئەوەیە لە یەك کاتدا: جەخت لەسەر مافی خۆی بکا و هێزی خۆی رزگار بکا و بیروباوەڕی خۆی بخاتەڕوو و تیۆرەکانی خۆیشی بەرهەمبێنێ ل١٠٣.

شۆڕش، لە رێگای دیموکراسیماندا دەتوانێ بمانخاتە سەر رێگای دیموکراسی پیشەسازی ل١٤٣. ئێستا ئەرکی دیموکراسی کرێکارییە کە کاروبارەکان بە دەستی خۆیەوە بگرێ و لە سەری پێویستە بانگەوازی خۆی بکا. پێویستە لەسەر دەوڵەت نوێنەری کۆمەڵگا لە ژێر ئەو پاڵەپەستۆیەی "ضغط" کە دەیەوێ بجوڵێتەوە، بەڵام ئەگەر دیموکراسی کرێکاری بە چاندنی بزاوت لە کارگەکان و لاوازکردنی بورژوازییەت و بەرزکردنەوەی "أبراز" خۆی لە هەڵبژاردنە بێ سوودەکانی، وازی هێنا، ئەگەر بەرامبەر بنەماکانی ئابووری سیاسی کە بنەمای شۆڕش کەم تەرخەمی نواند، پێویستە بزانێ کەوازی لە ئەرکەکانی خۆی هێناوە... رۆژێك بەرامبەر نەوەکانی هەست بەو کەموکوڕیانەی خۆی دەکا ل١٥١.

ئەوەی کە چاکسازییە هاریکارییەکان جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە لە یەك کاتدا، لە لایەن مافێکی توند و هەستێکی کۆمەڵایەتی باڵاوە هەستاوە بە رەتکردنەوەی هەموو جۆرێکی ستەمکاری سەپێنراوی سەر کرێکار ل١٨١.

ئەو کارگانەی، کە دەتوانن پارێزگاری لە ناوەکانی ئێستایان بکەن، کە ملکەچی یەکتر و ملکەچی جەماوەرێکن کە هەڵگری عەقلیەتێکی نوێن، جارێکی تر ناتوانرێ لەگەڵ نموونەی کارگەکانی ئێستا بەراوردبکرێن. بەڵکو رەوشتی خۆپەرستی و دوژمنکارانەی لەدەست داوە لە هەمانکاتدا بەوتایبەتمەندییە تایبەتیانەی بۆی فەراهەمکراوە توانا ئابوورییەکانی خۆی دەپارێزێ. ئەمانە هەموو وەکو چەند کلێسایەکی تایبەتن لە ناو کلێسایەکی گشتگیردا، ئەو کلێسانە دەتوانن خۆیان بەرهەم بێننەوە، ئەوەش لە کاتێکدا ئەگەر بۆی بکرێ بیکوژێنێتەوە ل١٩٦.

لە بواری مافدا دەبینین کە یەکیەتی ناتوانێ "مطبوع" پاشکۆ بێ، تەنها بەو پەیمانە نەبێ کە کۆمەڵە خاوەن دەسەڵاتەکان بە کۆمەڵەکانی تری دەدەن ئەو پەیمانانەش ئەمانەن:

١- فەرمانڕەوایی کردنی خۆیان بۆ خۆیان بە شێوەیەکی هاریکاری، مامەڵەکردنی لەگەڵ دراوسێکانیدا بەپێی بنەمایەکی دیاریکراو دەبێ.

٢- دژی هەر بێگانەیەکی دەرەکی و زۆردارییەکی ناوەکی پارێزگاری لە خۆی بکا.

٣- خۆ گونجاندنی لەگەڵ بەرژەوەندی بەرهەمهێنان و پرۆژەکانی و پێشکەشکردنی هاریکاری بۆ تاکە بێ بەشکراوەکان.

بەم شێوەیە دەبینین ئەوەی تا ئێستا ناو مان ناوە رێبازی هاریکاری و دەستەبەری، ئەگەر بچێتە بواری سیاسەتەوە، پێی دەڵێن فیدراڵی ل١٩٨.

مافی نوێ لە ناوەڕۆکدا ئیجابیە "پۆزەتیڤە"، ئامانجەکەشی دەستکەوتنی هەموو مافە کۆنەکانە کە رێگای کردارەکی کردنی بدرێ بەبێ هەوڵدان بۆ دروستکردنی



ئامراز و هۆکار، هەروەها بەبێ پیشاندانی هیچ رازی بوونێك یارازی نەبوونێك لەم بوارەدا ل٢٢١.

دەتوانین بڵێین هەموو رۆڵ و دیدگاکان لە نێوان بورژوازییەتی سەرمایەداری و بەڵێندەرانی و حکوومەت لە لایەك و لە نێوان دیموکراسی کرێکاری لە لایەکی ترەوە پێچەوانە بوونەتەوە: دیموکراسی کرێکاری چیتر جەماوەر فرەیی، فرەیی و سووکی پێ ناوترێ، بەڵکو ئەم ناوانە دراوەنتە پاڵ بورژوازییەت، ئەو بورژوازییەتەی کە کەوتە ئاستی رەشوڕووت و جەماوەرە گێلەکان...

بینیمان بورژوازی باڵا، دوای ئەوەی رووداوی سیاسی دوای رووداوی سیاسی تووش دەبوو، کە گەیشتە نزمترین پلەی بەتاڵی رۆشنبیری و رەوشتی، بوو بە کۆمەڵەیەك کە هیچ مرۆڤایەتی تێدانەبوو، تەنها خۆپەرەستی نەبێ، لە کاتێکدا بە دوای رزگاربووندا دەگەڕا کە هیچ رێگایەکی رزگاربوون نەمابوو، ئەمەش تەنها کەم تەرخەمییەکی بێ ئومێدانە بوو کە خستیانە روو، لە بڕی ئەوەی بە گۆڕانێکی حەتمی رازیبن، بانگەوازی دەوڵەت و ئەو گێژاوە دەکەن کە نقوومی کردوون ل٢٣١.

ئارام بگرن، دەبینین چینی ناوەڕاست، کە لە لایەن رکابەرێکی بەرز و روخێنەرەوە هەڵچنراوە، یا دەچێتە ناو جیهانی دەرەبەگایەتییەوە یا فڕێ دەدرێتە ناو چینی پرۆلیتاریاوە ل٢٣٥.

ئەو جیاکردنەوەی کە داوامان دەکرد مەرجی سەرەکی ژیانە، کە خۆمان جیاکردەوە و خۆمان دیاریکرد واتا ئێمە هەین، وەکو چۆن توانەوە واتا لە دەستدان و جیابوونەوە، بە شێوەیەکی یاسایی تاکە رێگایە بۆ جەختکردنە سەر مافەکانمان و بۆ خۆدەرخستنمان وەکو پارتێکی سیاسی دانپیانراو. بەم نزیکانە دەبینین ئەو چەکەی دەماندرێتی زۆر بە هێز تر و دڵسۆز ترە بۆ بەرگری کردن لە خۆمان، وەکو چۆن بۆ هێزشیکردنیش گرنگە ل٢٣٧.

کەواتە لێرەدا بە کورتی دەڵێم ئەو نموونە باڵا سیاسی و ئابوورییەی کە دیموکراسییەتی کرێکاری پەیڕەوی لێدەکا هەمان ئەو نموونە باڵایە نییە کە چینی

بورژوا پەیڕەوی لێدەکرد. بەبێ سوود، ماوەی زیاتر لە حەفتا ساڵە کە ئێمە ناتوانین لە هەمان پەرلەماندا خۆمان لەگەڵیاندا دەرخەین... هەتا لە هەمان بەرهەڵستکاریش، ئەو وشانەی لای ئێمە جیاوازییەکی بنەرەتی هەیە لە وشەکانی لای ئەوان، بە جۆرێك کە بیروباوەڕ و بنەما و شێوەکانی حکوومەت و دامەزراوە و ڕەوشت هەمان شت نییە، نە لە لای ئێمە نە لای ئەوان ل**٢٤٣**.

چینی کرێکار ئەگەر بە چاوی گرنگییەوە لە خۆی بڕوانێ و ئەگەر پەیڕەوی لە شتێکی تر کرد نەك وەهەم و هەڵەشەیی، پێویستە یەکەمجار لە ڕاسپاردن "الوصایە" دەربچێ، لێرەش بە دواوە لە خودی خۆی و لە پێناو خۆیدا بجوڵێتەوە...ل**٢٤٣**.

بۆ ئەوەی بێتەوە یادتان، کە یادکردنەوە گرنگە: لێرەدا لە نێوان یەکسانی و مافی سیاسی و یەکسانی و مافی ئابوورییدا پەیوەندییەکی بە هێز هەیە، بە جۆرێك بە هێزە کە ئەگەر یەکێکیان ڕەتکەیتەوە، ئەوی تر لە خۆیەوە بزر دەبێ ل**٢٦٧**.



## سوپاس و پێزانین.....

زۆر سوپاسی کاك عەلی مەلا سەید عەبدولرەحمان دەکەم کە یارمەتییەکی زۆری دام، هیوادارم هەمیشە لەش ساغ و سەلامەت بێت.

**ئارام ئەمین**